# پێرست

## ژیان نامەی نوسەر

جـەواد جەوهـــەری نوســـەری کتیبـــی خاڵـــە ڕەجـــەب و ... لـــە ســـاڵی ١٣١٥ هـــەتاوی لـــە شـــاری مـــەهاباد ( ســـابڵاغ ) لـــە دایـــک بـــوم، خویندنی ســـەرەتایی و ناونـــدیم هـــەر لـــە شـــاری مـــەهاباد دا تـــەواو کـــردو لـــە ســـاڵی ١٣٣٨ هـــەتاوی لەئیـــدارە کەشـــت و کـــاڵ دادامـــزریم هـــەتا ســـاڵی ١٣٤١ هـــەتاوی لـــە لایـــان ئیـــدارەو ڕاگـــویزرام بـــۆ شـــاری بۆکـــان هـــەتاکو ئیســـتا هـــەر لـــە شـــاری بۆکـــان دا ماومەتـــەوە، هەرلـــەم شـــارەدا ئـــۆگری خویندنـــەوەی زمـــانی داێـــک و بـــاوکم بـــوم و دەســـتم کـــرد بـــە نوســـینی چیـــرۆک و تەمســـیل(نمایشـــنامە) بـــە زمـــانی کـــوردی و فارســـی هـــەتا ئیســـتا نیزیـــک بـــە ٢٥ تەمســـیل و ٣٥ چیرۆکـــی کـــورت و دریـــژم نوســـیوە، کـــە لـــە شـــاری بۆکـــان زۆر کـــەس چاویـــان بـــە تەمســـیلەکانم کـــەوتووە و چەنـــد چیرۆکیشـــم لـــە نـــاو گوڤـــارە جوراوجورەکـــانی کـــوردی بڵـــاو کراوەتـــەوە، لـــە حـــاڵی حـــازردا چـــوار کتیـــبم ئامـــادی چـــاپ کـــردن هەیـــە کـــە ســـەیان چیـــرۆک و بەســـەرهاتن و یەکیشـــیان (دیـــوانیکی) گـــەورەی شـــیعرە کـــە ئینشـــاالله لـــە داهـــاتودا چاپیـــان دەکـــەم و بڵاویـــان دەکەمـــەوە بـــۆ خوینـــدەوارانی بـــەڕیز و خۆشەویســـتم. بەبۆنـــەیی ئـــۆگری زۆر بـــە خویندنـــەوەی کتیبـــە بەکەڵکـــەکانی کـــوردی و فارســـی مـــاوەی چەنـــد ســـاڵ هـــەولم دا و تیکوشـــیم بـــۆ ڕوون بونـــەوە، نـــە بـــۆ نیـــو و هـــەژاری و دەســـت کـــورتی و ... هـــەتاکو تـــوۆانیم پەیکـــەری خاڵـــە ڕەجـــەب و .... بـــە جـــوریکی جـــوۆان و ڕیـــک و پێـــک و زمـــانیکی هاســـان بـــەدیی بـــەهینم و پیشکەشـــی بەکـــەم، بـــەڵکو بتـــوۆانم بـــەگویرە خـــۆم یارمـــەتی ئـــەدەبیاتی و فەرهـــەنگی زمانەکـــەی خـــۆم بـــەدەم. لـــە ســـەرەتا لـــە هـــەمو نوســـەر و شـــاعیرە

بەڕێزەکان کە بۆ زیندو کردنەوەی ئەدەبیات و زمانی کوردی شەو و ڕۆژ هەوڵ ئەدەن سڵاو گەرمیان پیشکەش دەکەم و دەستیان ماچ دەکەم، ئەم کتیبەی نوسیومە بریتی لە چەند ڕوداوی ڕاستین، بەسەر هاتی ڕاستەقینەن کە هەموو رۆژیک زۆربەیان بەچاو دەبینین و بە گویمان دەی بیستین. مەبەست لە نوسینی ئەو کتیبە و ئەو ڕۆداوانە دابین کردنی هێندی نوسراوە بو لاوەکانە، لە دووایی دا گوفتوگو لەگەڵ گەورەکانە ....لام وایە خاڵە ڕەجەب نوسینیکی سوک و هاسانە بو خویندنەوە کە بە داویکی باریک و ناسک پیکەوە نوساوە .... .

لە خاڵە ڕەجەب دا ئەمەوی ژیانی ئەوکەسانەی کە زۆرتر لە بیری تەنگە و چەڵەمەی ژیانی ماڵ و خێزان دان و ... لە پیویستی خۆشی و ئاسایش جوراو جوردان بخەمە بەرچاو.

خویندەواری بەڕیزم لام وایە باش ئەزانن کە فەرهەنگ و زمانی ئیمە وەک نان و ئاو پیویستی زۆر بە زیندوکردنەوەی ، وشە ، میژو و باس کردن و بە سەرهات هەیە جا لە بەر ئەوە ئەبێت هەرکەس بەگویرەی خۆی یارمەتی بە زبانی کوردی بداتو زۆرتر هونرمەندەکان بە شیعر، بە هەلبەست، بە گۆرانی و هۆنراوەیان بە کوردی داناوە ، تەنیا هونەرمەندەکان نین بەڵکو نوسەرە بەڕێزەکان لەو ڕیگایەدا زۆریان بۆ زیندوکردنەوەی زمان و میژوی کوردی هەولیان داوە و تێکوشاون، ئەرکیکی گرینگیان بە ئەستوی میلەتی کوردەوە هەیە ئەویش جێگای شانازیە هەتا هەتایە.

ئیتر بەسوپاسەوە ـ نوسەر : جەواد جەوهەری

# چارە نوس

بەشی یەکم




شـــەوی هــــەینی بیـــست و چـــوارەمین ڕۆژی مــــانگی موبـــارەكی ڕەمـــەزان بـــوو، لـــە ماڵـــەوە دا نیـــشتبوین خــــەریکی خــــواردنی نــــانی شــــێوان بــــوین بــــە قۆلیــــك(ئیفتارمــــان ) دەكــــردەوە، لــــە پــــڕدا لــــە درگــــای حەوشــــەیان دا و هاواریــــان بــــۆ هێنــــاین كــــە خیزانــــی یــــەكی لــــە دراوســــێكان زۆر نەخۆشــــە و كــــاری نەخووشــــخانەی هەیــــە، منــــیش پیاڵەیــــەكم چــــایی بــــە دەســــتەوە بــــو نــــەم زانــــی چــــۆنم خــــواردەوە، بــــە پەلــــە جلــــەكانم لەبــــەر كــــردو ڕویــــشتمە حەوشــــە و ئوتومبیلــــەكام ئامــــادە كــــرد، لەگــــەڵ ڕاســــپیراوەكە چوینــــە بــــەر درگــــای مــــاڵی كــــاك عــــەلی دراوســــیمان، بــــە گــــۆرجی ژنــــە نەخۆشــــەكەمان لــــە گــــەڵ میردەكــــەی خــــستە نــــاو ئوتومبیلەكــــە و بــــەرو نەخۆشــــخانە كەوتینــــە ڕێ، كــــاتی گەیــــشینە نەخۆشــــخانە، نەخۆشــــەكەمان بــــە گــــورجی بــــەرو بەشــــی نەخۆشــــی ژنــــان بــــردە ژوروە، یــــەكی لــــە نەخۆشــــەوانەكان ( پرســــتار ) قــــۆلی نەخۆشــــەیان لەگــــەڵ میردەكــــەی گــــرت و بریــــان بــــۆلای دوكتــــور، منــــیش لــــە هۆدەكــــەی پێــــشەوە لــــە ســــەر

کورسیلەیەک دانیشتم، چاوەڕوانی کارەسات بوم، لەدڵی خۆم چومەناو ناخی بیرەوە، بیرم لەمە دەکردەوە چلون بەفەرمانی خوا منالێک دێتە سەر دونیاو چلون گەورە دەبیت و ژیان دەکاو چلون لە پاش تەواو بونی عومری لە دونیا دەڕوا .... لە بەرامبەری من ژنیکی نیوان ساڵ و پیاویکی سەمیڵ زل و سەروریش سپی دانیشتبون، لام وایە دەمێک بو چاوەڕوان بون زور دانیشتبون و تاقەتیان بەسەر چوبو، بویە کابرا کاتی چاوی بەمن ئەکەوت، سەری گوفتوگوی دامەزراند، روی تێکردم و وتی کاکە ئەم ئافرەتە کی بو؟ چی تویە؟ چاوەڕوانی وڵامی، من بو منیش سەرم هەڵبری و روم تێکرد و وتم: ئەم ئافرتە دراوسیمانە، ئەم کابرایەی کەلەگەڵی ڕویشتە ژوری میردی ژنە نەخوشەکە بو، هەروەک وتم من دراوسیانم لەبرئەوە بانگی شیوانی دابو وە کات دەرنگ بو خەڵکی خریکی خواردنی بەر بانگ بون و ئوتومبیل دەست نەدەکەوت منیش بە ئەرکی سەر شانی خوم زانی بە ئوتومبیلەکەی خومە بیان هێنم بو نەخوشخانە ، کابرا وتی : خوا جەزای بەخێرت بداتەوە کاکە گیان. منیش سوپاسم لیکرد. ئەمجار لەژێرەوە بە جووانی ڕوانیمە کابرا، جوتێک پێڵاوی کونی

زەلی لەپێ دابوف پانتۆڵیکی دەڕاو و چاکەنێکی زۆر پیس و
چڵکنەی لەبەردا بو پیم وا بێت ماوەیەکی زۆر بو جلەکانی
نەشۆری بو، بۆیە وەها چڵکن بون، ئەمجار ڕۆانیمە ڕواڵەتی موی
سەری ئەوندە زۆر بو کە نیوەی نیوچاوانی و هەردۆک
لارۆمەتەکانی داپۆشیبو، سەمیڵی ئەوندە زل بو کە لەگەڵ موی
سەری تێکەڵاو ببو، سەرەڕای ئەمە، مودنەیەکی گەورە و زەلامی
بەدەستەوە بو کە سیغاریکی ئەستوری هەڵ چێچابووە بە سەر
مودنەکەیەوە چەقاندبو لەبرئمە ئەو هۆدەی کە ئیمە لە ناوی دا
دانیشتبوین رۆ بە حەوشە بو سیغارکێشان ئازاد بو، کابرا
سیغارەکەی داگیرساندو هەموجاری کەمژی لە سیغارەکە دەدا بە
باقە دوکەڵیکی شین لەناو دەمی دەهاتە دەر، زۆر باش دیار بو
هێندەی سیغار کیشابو، کە بەتەواوی بەرو پەشتی سەمیڵی بە
دوکەڵی سیغارەکە زەرد زەرد ببو، ئەمجار من پرسیارم لیکرد،
وتم : کاکە ئەوە ئەتۆ چلۆنە هاتویتە ئیرە؟ کابرا وڵامی داوە: بە
خۆوا منیش خێزانم هیناوە، بەقسەی خۆی ئەمشەو ویان بەیانی
بارسوک ئەبی و منالی ئەبی. منیش لە وڵامدا وتم: خۆوا پێتان
بەهێڵی. کابرا وتی : برام خۆ ئەوە هەوڵ منداڵمان نییە، لەم ژنەی

کەوا لەلام دانیشتووە، شەش منالّی گەورەم هەیە، ئەوەی کە وا ئیستا لای دوکتورە، هەولْ منداڵیتی. من وتم : چۆن شەتی وەها دەبی برام؟ لە ولامم دا وتی : ژنە بچوکەکەم پارەکە هێناومە، ئەم وەکو ئەمە پیرو لە کار کەوتو نییە، ئەمیان لاوە و گەنجەو جوۆانە و ژیکەڵەیە، تەمەنی تازە هەژدە ساڵە. من سەرم سوڕ مابو، کابرا تەمەنی حەفتا ساڵْ دەبو، تازە ژنی هەژدە ساڵەی هێناوە......

لەژێرەوە چاوم لە ژنەکەی کە لەلای میردەکەی دانیشتبو کرد،دیتم ژنیکی بەڕۆا لەت هێدی و فەقیر و لەسەرە خۆیە. ژنە کە لەقسەکانی کابرا ڕەنگی سور هەڵگڕا و سەری داخەست و هیچی نەگوت، بەڵام لیی دیار بو کە لە تەۆاوی ژینی ڕابردوی دا، چەند کەساسی و نەبونیو بەڵای تەنگو چڵمەی ژیانی بە سەر هاتووە ........پیم ۆابیْ لە دەوڕانی ژین و ژیانی دا قەت تامی خۆشیو و ئاسایش و بەختوەری نەچیشتبو.

جوتێک پیڵاوی لاستیقی دڕاو و کۆنی لەپیْ دابو، چارشیوێکی ڕەشی پینەکراوی بەسەر دادابو، لەژێر چارشێوەکە قژی سەری ڕەش و سپی تێکەڵاو دیاری دەکرد، دەمو چاوی چەرچ ببو، تۆزیک تیک شەکاویو، بەڵام ۆا دیار بو کەئیستاش

هێــز و توانــای ئــیش و کــاری مــاوە خــۆی تەســلیمی پیــری و شــەربار بــون نــەکردووە، لــەم کاتــەدا ژنــی دوهــەمی کــابرا لــەلای دوکتــور هاتــە دەروە، یــەک ڕاســت ڕویــشت بــۆلای ژن و پیاوەکــە........ کــاتی مــن چــاوم پێکــەوت دیــتم کیژیکــی ژیکەڵــە و دەموچــاو ڕیــک و پێــک و جــوان و کورتــە باڵــا قــەڵو و تێــک ســەڕما و تەمــەنی هــەر هــەژدە ســاڵی دەبــو، دو خــاڵی شــین لەســەر گۆنــاو وە لــە ســەر چەنــەی خۆیــان ئەنوانــد، لەیــەکی قــژی لــە ژێــر چارشــیوەکەی دەرکــەوتبو ڕەش ڕەش وەک قــەترانی ڕەش ســەر گۆناکــانی ســورو خــەزیمێکی ئــاڵتونی لەســەر لــوتی بــو، وەک ڕەســمیکی جــوان ڕونــاکی بــە دموچــاوی دابــو، کــاتی دەســتی کــرد بەپێکــەنین دو ڕیــزە ددانــی ورد و ســپی و ســاخ لــەژێر لێوەکــانی دەرکــەوت، ئــەمجار کــابرا خــۆی ڕاکیــشا بــۆلای مــن و وتــی: بــرام ئەمــەش ژەنەکــەی دیکەمــە، دوژنــەکانیش هــاتن بــۆلای مــن و هــەر ســی کیــان مــەنیان گــەمارو دا، ئــەمجار کــابرا ڕوی کــردە مــن و وتی : بــرام مــن بــەم ژنــەم گــوت تونێــستا بــار ســوک نــابی بــەڵام بــاوەڕی بــەمن نــەکرد بــەم شــەوە ئیمــەی لــەناو چادرەکــەمان ڕاکێــشا بــۆ ئیــرە، ئــاخر بــرا مــن چــی و نەخۆشــخانە چــی؟ نــازانم ئێــستاش یەوتــەی دوکتــور ڕازی بــووە یــان نــا .... مــن ڕەق ڕاوەســتا بــوم ســەر ســوڕ مــابوم،

بە دڵم داهات کەئیمەی گەلی کورد چەند دڵ ساف و فەقیر حاڵین خۆ من دادپرس و قازی نیم، تاکو بەتۆانم تەنگە وچەڵەمەی ئیوە بە ئەنجانم بگەیەنم، خۆم کار بەدەستی حوکومەت نیم کە بتۆانم ناو ئیوە دا ناوبژی بکەم.

کابرا دەمی گەرم داهاتبو پیتا پیتا باسی خۆی و سوک باربونی ژنەکەی دەکرد، منیش چارەم نەبو گویم بۆ شەل کردبو بەڵام لەم بیرەدا بوم چلۆن ئەمەی ۆا لە دڵم دایە، بە کابرا و ژنە تازەکەی بەڵیم خوۆا و ڕاستان زۆری نەخایاند ژنە گەورەکە هاتە جۆاب و وتی: برام ئەم دووۆانە ماوەی ساڵیکە کەزەماوندیان کردووە، ئەم کابرایە و ئەم ژنە تازەیەی بە سەر من هێناوە بەڵام گەشت ڕۆژی دمەقاڵە یانە و نان و ئاویان لە من و مناڵەکانم حەرام کردووە. من تازە وەهۆش هاتمەوە کەئەم ژنە لەگەڵ من وتووۆیژ دەکات، ڕۆم کردە ژنە بچوکە کە و وتم : خۆشکم پرسیاریکەت لیبەکەم تورە نابی؟ ژنەکە وتی: برام بۆچی تورە بم. لیم پرسی و وتم : خۆشکم ئەم مەسلەتە چۆن پێک هات کەتۆ میردت بەم کابرایە کرد؟ تۆ بەم کەم ساڵیتەو مندال کاری وە ئەم برایم بەم تەمنە زۆرە وە کەخاوەنی ژن و شەش مناڵی گەور

گەورەیە شوت پیٚ کرد؟ ژنە بچوکەکە لام وا بو ناوی زینەب بو، هاتە وڵام و جووابی دامەوە و وتی : برام چارەنوس، هەناسەیەکی هەڵ کیشاو، لە دریژەی وڵامی دا وتی: لەگەڵ چارەنوس هیچ ناکری ... ئەم جار میردەکەی هاتە وڵام و وتی : بە خووا کاکە زینەب وەهات گیرۆدەی من ببو هەتا مارەم کرد لەوانەبو شیٚت بیٚ. ئەمجار زینەب وتی : بە خووا برام وا نەبو، قەت قەت ئەم پیاوە پیرەم لە خەویش دا نەدیبو بەڵام لەگەڵ کاری خووا هیچ ناکری ... . من بە گاڵتەوە وتم : براژن بڕاستی تۆ گیرۆودەی ئەم پیاوە بویت؟ زینەب ئەمجارەش لە ناخی دڵەوە هەناسەیەکی هەڵ کیٚشاو وتی : ئیمە ئیلاتین ( قەرەچی) لەهەمو سنورەکان ئازادین، بە دریژی ساڵ لە هام و شوی داین، گەرمین و کویستان ئەکەین زۆربەی دەسن کەوتی ئیمە لە دروست کردنی بیژنگ، هیلەگ، چەقو و دەفە و ئەم جورە کەلوپلانە یە، لام وا یە تۆش ئەزانی ئیمە لە ناو خیٚوەت دا ئەژین، کاتی بە دونیا دیٚن یا لە ناو خیٚوەت دا یان لە ڕیگا لە دایک ئەبین، ئەمجار لە ناو خیٚوەتەکەدا ئەژین و گەورە ئەبین وە ئەگر خووا قەسمەت بکات هەر لەناو خیٚوەتەکەدا ئەمرین، بەڵام براکەم بەسەر هاتی من و میرد کردن بەم پیاوە بەم

جۆرەیـە، لـە تەمـەنی چـوارده سـالّی دابـوم کـە خـوا دایکـەمی بـردەوە بـۆ لای خـۆی دایکـم مـرد لـە پـاش کـۆچی دایکـم مـن مامـەوە و سـێ منـالّی بچـوکی بـێ کـەس و پیـره باوکەکـەم کـەباوکم لـە تەمـەنی ئـەم میـرده دا یـە. تـەواو مـاوەی سـێ سـالْ بـاوکم ژنـی نـەهێنا، مـن سـەر پەرسـتی مالّومنالّـەکانم دەکـرد بـە دروسـت کردنـی بێژنـگ و هێلّـەگ و ئـەم جـۆره شـتانە، ژیـانی پـڕ لـە تـەنگو چەلّەمـەی خۆمـان رادەبـوارد هـەتا تەمـەنم گەیـشتە هـەژده سـالْ لـەناو هۆزەکـەی خۆمـان زۆر کـەس زۆر کـوڕی گـەنج و لاوی جـوان لەتەمـەنی خـۆم دا داواکـارم بـون بـەلّام . . . زینـەب تۆزیـک ڕاوەسـتا ئـەمجاریش هەناسـەیەکی هـەلْ کێشاو وتـی : هـەتا ڕۆژیـک ئـەم کابرایـە کـە نـاوی تۆفیقـە هاتـە نـاو خێوەتەکـەی ئیمـە منیش لـە دەرەوە خریکـی ئـیش و کـاربوم لەگـەلْ بـاوکم دانیـشتن زۆریـان وتـوویژ کـرد لـەبر ئمـەن تۆزیـک دور دانیـشتبوم لـە وتوویژەکانیـان حـالّی نـەدەبوم لـە پـاش ماوەیـەکی زۆر تۆفیـق لـە خێوەتەکـە دەرکـەوت ... ڕۆیـشت ئـەمجار بـاوکم هـاواری لێکـردم، منـیش ڕۆیـشتمە نـاو خێوەتەکـە ... بـاوکم وتی : زینـەب ڕۆلّـە مـن تـۆم بـە شـودا. لـەبر ئمـە مالّـە کـە چـولْ نـەبێت و منالّـەکان ئـاواره نـەبن، بۆخۆشـم ژن هێنـا. مـن زۆرم پیخـۆش بـو کـە

باوکم لەتەنیای ڕزگار ئەبێت و منیش سەر و سامانێک ئەگرم ....
لام وابو کە تۆفیق مەنی بۆ کورەکەی خوازبێنی کردووە بەڵام لە
پاش ئەواو بونی قەسەکانی باوکن بۆم دەرکەوت کە تۆفیق
خۆشکیکی بێوەژنی هەیە کە دو شوی کردبو وە تەڵاق دەراوە و
لەبرنەبونی منداڵ ئیستاش لەلای تۆفیق ئەژی باوکم و تۆفیق
بڕیاریان وا داناوە کە من بدەن بە تۆفیق و خۆشکی تۆفیقش لە
باوکم مارە بکەن بە مانای ژن بە ژن، کاتی من ئەم مامەڵەیم
بیست وەک خەنجەریک لە سەر دڵم دەن بری چاوەکانم تاریک
بون نەم زانی شەوە یان ڕۆژە، رام کردە دەرەوەی خێوەتەکە
دەستم کرد بە گریان و .... منداڵە لیقوما و بێ تاوانەکانم لە دەوری
خۆم کۆکردەوە خەفەتیکی زۆر دایگرتم زۆر گریام بەڵام چەم لە
دەست نەدەهات و .... لە پاش حەوتو یەک منیان لەم پیاوە ڕیش
سپیە مارە کرد و خۆشکی تۆفیقیش بو بە ژنی باوکم زۆرت سەر
نەهیشینم ئیستاش ئمە ماوەی ساڵیکە لەگەڵ تۆفیق و هویکەم
کە ئەم ژنەیە وە کوڕوکچەکانی ئەوە ژیان دەکەین... لە پاش تەواو
بونی قسەکانی زینەب ، من زۆورم ئەم کارەساتە و ئەو
بەسەرهاتەم پێ سەیربو پرسیارم لێکرد و وتم : خۆشکە زینەب

ئایا تۆ بەم ژن بەژنە و ژیان لەگەڵ هویکە تۆ و کاک تۆفیق و شەش منداڵەکانی ڕازی؟ زینەب ئەم جار زۆر بەخەم ناکێوە هەناسەیەکی هەڵ کێشاو ڕۆی تێکردم و وتی : لەگەڵ چارەنوس هیچ ناکریت برام ... کاکە گیان خۆت بیری لیکەوە من هەژدە ساڵمە و تۆفیق پەنجاو هەشت ساڵیتی ئایا ئەبێ ڕازی بم. چاوەکانی پڕبون لە فرمیسک . تۆفیق هەتا ئەو کاتە بێ دەنگ بو لە پڕدا هاتە جواب و بەدەنگیکی برز وتی: بڕو .. بڕو بابڕوین کچەتیوە بە خووا لە خۆشیان نازانی ئلیی چی. کات درەنگە و منداڵەکان چاوەڕوانی ئیمەن . لەو کاتەی دا کە خووا‌حافیزیان دەکرد و بارانی فرمیسکە گەرمەکانی زینەب بە جووانی ئەبین درا کە بە لا چاوەکانی دا ئەهاتە خوارەوە. لە پاش ڕۆیشتنەنی ئەوان من مامەوە و کۆلیک پرسیار لە خۆم، کەوتمە ناو چەمی بیر و پرسیارەوە لە دەڵی خۆم دا وتم« ئایا بەڕاستی کی تاوان بارە؟ تۆفیق؟ مردەنی دایکی زینەب؟ باوکی زینەب؟ ڕەگو ڕەسەنی ئیمە؟ فەرهەنگو کەلتوری ئیمە؟ نە خویندەواری و نا ئاگاداری ئەم تاقمە ئاوارە و سەرگەردانە بە ناوی قەرەچی یان بنەڕەتی چپەڵو و ناشیرین و ناحەزی ژن بە ژنە؟ ئایا بەڕاستی کی دەبێ ئەم

کارەساتە چەپەڵە کە بۆ ئێمە بۆتە کۆسپێکی گەورە و پتەوقایم.
کەوەک کۆلکە داریکی ڕزیو ڕیشەی داکوتاوە ڕیشەی بەسوتینی
و لە ناوی بەریو ئەم پینەڕەشە لە سەرشانمان ببێتەوە... . لە سەر
کورسیلە کە دانیشتم، لە قوڵای دڵەوە بیرم لەم بەسەر هاتو
کارەساتە دەکردەوە کەلە پڕدا کاک عەلی درواسیمان بەخۆشیوو
پیکەنینەوە بەرو پیرم هات و مزگینی پێدام کە خوۆای گەورە و
میهربان کوڕیکی کۆزپە و جوۆان و قونیجلانەی پێداون و
ژنەکەشی بە سڵامەتی ڕزگاری بووە ... منیش پیرۆز بایم لیکردو
بەڕۆالەت لەبر دڵی ئەو خۆم زۆر خۆشحاڵ پیشان دا، بەڵام
خەفەتی ژن بە ژنە لە ناو دڵم دا مابۆوە، سەۆاری ئوتومبیلەکە
بویم و لە نەخۆشخانەکە برو ماڵ دەرکەوتین کاک عەلی زۆر شاد
و کەیف خۆش بو لە ڕیگا دەستی کرد بە گاڵتە و گەپ و پیکەنین
و قسەی خۆش خۆش باسی میۆانی و میۆانداری دەکرد، باسی
جەژنی نیونانی مناڵەکەی ئەکرد لە خۆشیان هەر هەڵ ئەبەزیوە ...
لە برئمە دوکەچی هەبو لە سایەی خوۆاوە ئەمەیان کوڕ بو،
پرسیاری لەمن دەکرد ناوی چەی بنین باشە، من لە وڵام دا وتم:
هەر ناویک خۆشە با ئەمە بیت. کاک عەلی وتی: ناوی ئەنیم ئازاد،

جاریک ئەیوت بە خووا شێرکۆ، هەر جارە ناویکی ئەدۆزیوە و ئەیگوت بەم جۆرە بێ وچان ناوی هەڵ ئەدا و پێ دەکەنی. منیش ناچار بوم لە برد دڵی ئەو بەڕواڵەت پێدەکەنیم و لە شادی ئەودا بەشداریم دەکرد. بەڵام لە ناو دڵم داغەڵبە بو هەرا بو هۆشم لە جێگایەکی کەوەبو، بیرم لە دواڕۆژی کارەساتی ناحەزو چەپەڵ و ناشیرینی ژن بە ژنەدەکردەوە. بە سلامت کاک عەلیم گەیاندەوە بر دەرگاکەیان و خووا حافیزیم لی کردو ڕۆیشتمەوە بۆماڵی خۆمان بەڵام بەدڵیکی خەم گینەوە ... .

بۆکان سالی ١٣٦٤ هەتاوی

بەشی دوهەم

# خالە رەجەب



کـــاتێ رۆیـــشتمە نـــاو چایخانەکـــە، تەماشـــام کـــرد لـــە بـــر دوکـــەڵی جگـــەرە و دوکـــەڵی قـــەلیان تارمایـــەکی ڕەش وەک پەڵـــە هـــەوریکی توند نـــاو چایخانەکـــەی داگرتبـــو، جـــا لـــە بـــر ئمـــە ئـــەو کەسـانەی یـــان ئەوکەسـەی لـــەدەرەوە تـــازە ئەچونـــەناو چایخانەکـــە هـــەتا ماوەیـــەک لـــەبر ئـــەم تارمایـــە بـــر چـــاوی تاریـــک دەبـــو، دوســـتو دوژمنـــی بەباشـــی لـــە یـــەک جیـــا نـــەدەکردەوە، بـــەڵام کـــە تۆزیـــکڕائەوەســـتا ئـــەمجار عـــادەتی دەگـــرت و چـــاوی دەگێـــرا کـــە لـــە قولینچکیـــک لـــە پـــەنا یـــەک کورســـیلەیەکی وەدەســـت کـــەویت و لەســـەری دانیـــشی و چایـــەکی بخۆاتـــەوە ئـــەمجار لەگـــەڵ یـــەک دو ناســـیاو دەســـتی دەکـــرد بـــە وتـــوویژ، منـــیش لـــە بـــر ئمـــە تـــازە چوبومەئـــەم شـــارە و غـــەریب بـــوم وەکەســـم نەئەناســـی ئـــەو ڕۆژە ئەوندە بـــێ تاقـــەت بـــوم لـــە بـــر بـــێ تاقـــەتی وۆام بـــاش زانـــی بـــەچم بـــۆ ئـــەم چایخانـــە و یـــەک دو چـــایی بخۆمـــەوە و تۆزیـــک بحەســـیمەوە، خـــوۆا ڕاســـتان تۆشـــی ئـــەم چایخانـــە بـــوم چایخانـــە کـــە پـــڕ لـــە خـــەلک بـــو جەماعـــەت ریزاوریـــز دانیـــشتبون و خـــەریک وتـــوویژ و چـــای خۆاردنـــەوە بـــون و قـــەلیانیان دەکێـــشا، تاقـــەمێکش کوزیلـــەیان

بەستبووە لە دەوری پیاویک نیوان ساڵ کوببونەوە، چاوم پێکەوت جارجار مژیکیان لە قەلیانەکە دەدا و جارجاریش بە دەنگی بەرز دەستیان دەکرد بە پێکەنین من کە وا ڕەق ڕاوەستابوم وە جێگای دانیشتنم نەبو، لە ناچاری ڕوم کردە خاوەن چایخانەکە بەڵکەم بیریک بۆ حاڵم بکاتەوە و جێگایەکە بۆ دانیشتن بدۆزیتەوە بەڵام خاوەنی چایخانەکە جگەرەیەکی بەلا لیوی وە نابو ئەڕوانیە خەڵکەکە و بزەی سەمیڵی ئەهات و مژی لە جگەرەکەدەدا وام بۆ دەرکەوت ئمەیی لە بیری من نییە کابرای چایچی بو ناچار ڕۆیشتمە برەوە خۆم ڕاکیشا بۆ لای تاقمەیەک باش بو خووا ڕاستان کورسیلەیەک چۆڵ بو. کەسی لەسەر دانەنیشتبو بە گورجی هەر وەک هەڵو خۆم گەیاندی و لە سەر کورسیلەکە دانیشتم چەند کەسێک کە لە دەوربەرم بون تیم ڕوانین و چاویان لێکردم، لام وابو کەزانیان ناسیاو نیم لە پیاوەتی خۆیان دەستیان بەرز کردەوە و بەخیر هاتنیان کردم منیش هەروەک ئەوان دەستم بەرز کردەوە و سوپاسم لێکردن ماوەیەکی نەخایاند کابرای چایچی چایەکی گەرمی بۆ هێنام و لە پێشی دانام و پرسیاری کرد: قەلیان دەکێشی؟ وتم: نا.

دورکەوتـەوە و ڕۆیـشت زۆر تامـەزرۆی چـایی بـوم خیـرا بـە گـەرمی چایەکـەم خـوواردەوە، ئاواتـە خـوازی ئمـە بـوم کـەزو چایـەکی کـەم بـۆ بـەهینی. لـەپاش خوواردنـەوەی چایەکـە هـەروەک بـە چەنـد کـەس پـالم پێـوە بـەنین هێـواش هێـواش کورسـیلەکەم ڕاکێـشا و خـوم گەیانـدە لای کوزیلەکـە کـە لـەلای کـابرای دانیـشتبون کـابرا کـە هـەولین جـار بـو چـاوم پێکـەوت بـو قـەتم نـەدی بـو و نـەم ئەناسـی دەمـی گـەرم ببـو دەسـتی کـرد بـە وتـوویژ بـاوەر بکـەن مەتـەڵ و گۆفتـەی وەهـای دەگێـراوە کـە مـروڤ خـوی پێـڕا نـەدەگیرا و لـە بـر خۆیـەوە دەسـتی دەکـرد بـە پێکـەنین، بـوم دەکـەوت کـە بەڕاسـتی پیـاویکی وتەخۆشـە و شـاد و سـەرەحاڵە، منـیش ویـڕای خەڵکەکـە دەسـتم دەکـرد بـە پێکـەنین. پرسـیارم لـە پیاویـک کـرد وتـم : ئـەری کاکـە ئـەم پیـاوە کـی یـە و نـاوی چییـە؟ کـابرا روی تێکـردم و وتـی : لام وایـە تـۆ خـەڵکی ئیـرە نیـت. وتـم : نـە بـرام مـن غـەریبم تـازە هاتومەتـە ئیـرە. کـابرا ئـەمجار بـە روی خۆشـەوە وتـی : بـرا کـەم ئەمـە نـاوی خاڵـە ڕەجەبـە، وتـەوویژ و قـسەخۆشی ئـەم شـارەیە. ئـەگر یـەک دو ڕایـی کـە بێـت بـۆ ئیـرە یـانی بـۆ ئـەم چایخانـە تـۆش هـەر وەک ئیمـە ئـۆگری خاڵـە دەبـی و گەشـت ڕۆژی هـەر وەک ئیمـە لیـرە حـازر

دەبی، بەڵام ئەبی تۆزیک زوتر بێت کە بتوانی جێگا بگریوە ... لە قوڵایی دڵەوە ڕوانیمە ڕواڵەتی خاڵە ڕەجەب بەڕاستی پیاویکی لیهاتو و ڕیک و پێک و خوێن شیرین و لە بر دڵان بو، خاڵە مرۆڤیکی نە زۆر لەڕ و لاواز بو نە زۆریش قەڵەوتێک سەڕماو بو لە دڵی خۆمدا وام لیکداوە تەمەنی هەر لە دەوری شەست یان شەست و دو ساڵ هەر لەم میزانەدا بو، بەڵام ڕواڵەتی وای پیشان ئەدا کە لە دەورانی ژیانیدا تاڵیو و سویری زۆر کێشابیت، بەڵی ئەو ڕۆژە هەتا ئێواریکی دەرنگ منیش وێرای خەڵکەکە لە دەوری خاڵە ڕەجەب دانیشتن و گویم بۆ وتە خۆشەکانی شەل کردو وە لە خۆشیو و پێکەنین دا بەشدار بوم، بەڕاستی نەم زانی ئەو ڕۆژە چۆن ئاوا بو ئەوندەم ئاگا لیبو کە خاڵە ڕەجەب کات ژمێرەکەی لە باغەڵی دەرهینا و چاوی لیکرد و وتی: براکان ئەمرۆش ڕۆژمان ئاوا کرد ئیتر کاتی چونەوە یە بە خوواتان ئەسپیرم.

خەڵکەکە بە دەم پێکەنینەوە دەستی خاڵەیان بە گەرمی گوشی و خووا حافیزیان لیکرد و بڵاوەیان کرد، منیش وێرا ئەوان لە چایخانەکە دەر کەوتم و بە روماڵ ڕۆیشتم شەو لە پاش شیو

خـــوواردن ڕۆیـــشتمە نـــاو هۆدەکـــەی خـــۆم و ڕاکـــشام بـــەڵام خـــەو لـــە
چاوەکـــانم بتـــەواوی دور کـــەوتبۆوە بیـــرم لـــە قـــسە و وتـــە خۆشـــەکانی
خاڵـــە دەکـــردەوە لـــە دڵـــی خـــۆم دا وتـــم ئـــەبێ خاڵـــە لـــە لایکـــەوە زۆر
دلـــەخوش بـــی لـــە بـــر ئمـــە لـــەم تمەنـــەدا ئێـــستاش هـــەر وەک لاویکـــی
گـــەنج ئـــاوا بـــەهێز و بەتاقەتـــە. زۆرم بیـــر کـــردەوە ... نـــەم زانـــی چـــۆن
خـــەوم لیکـــەوت و دڵـــم ئـــارامی گـــرت، بیـــانی هـــەروەک ڕۆژانـــی پێـــشو
ڕۆیـــشتم بـــۆ دایـــرە و ســـەر ئـــیش و کارەکـــەم ئـــاخر لـــە بـــەر ئەمـــە
ڕاســـپراوی ( کارمنـــد ) حوکومـــەت بـــوم، ســـەر لـــە بیـــانی تـــاکو دووای
بـــانگی نیـــوەڕۆ لـــە دایرەکـــە دا ئـــیش و کـــارم ئـــەکرد بـــەڵام تـــەواوی پـــاش
نیوەڕۆیـــان بێکـــار دەخولامـــەوە وام بـــە بـــاش زانـــی کـــە گەشـــت ڕۆژان
پـــاش نیـــوەڕۆ بـــەچم بـــۆ چایخانەکـــە و گـــوی شـــەل کـــەم بـــۆ
وتەخۆشـــەکانی خاڵـــە ڕەجـــەب. مـــاوی چەنـــد ڕۆژیـــک گەشـــت پـــاش
نیـــوەڕۆ پـــاش نیـــویژی ئێـــواران ئـــیش و کـــارم ئمـــە بـــو کـــە زو بگەمـــە
چایخانەکـــە و جیگـــای خـــۆم بگرمـــەوە و چایـــەکی گـــەرم بخۆمـــەوەو
گـــوی ڕابگـــرم بـــۆ وتەخۆشـــەکانی خاڵـــە ڕەجـــەب، زۆری پینـــە ئـــەچو
دەوروبـــرم پڕدەبـــووە کـــاتی خاڵـــە ئـــەهات و دەســـتی دەکـــرد بـــە وتـــە و
مەســـلە خۆشـــەکانی تـــەواوی ئەوانـــە کـــە گویـــان لیئـــەبو بـــە تێکڕایـــی

دەستیان دەکرد بە پێکەنین و شادمانی، منیش ئەوندە ئۆگری قسەکانی ببوم و پیم خۆش بو هەمو شەتیکم لە بیرئەچووە و هیندە سەرەحاڵ دەبوم نەم ئەزانی کەیی بانگی شیوان ئەداو وە کەیی ڕۆژ ئاوە ئەبێت و بڵاوەمان دەکرد و ئەچومەوە بۆ ماڵەوە، هەتاکو ڕۆژیک من زۆز زو خۆم گەیاندە چایخانەکە و جیگای خۆم گرتەوە، ڕۆانیم زۆر لە هاوالەکانم لە پێش من دا جیگای خۆیان گرتبۆوە و کۆزیلەیان بەستبو وە لەگەڵ یەک وتوویژیان دەکرد پاش ئەوە کە دانیشتم و چاک و چونیمان لەگەڵ یەک کرد ئاخر لەم ماوەیەدا کە هاتو چوی ئەم چایخانەم ئەکرد لەگەڵ زۆریان ببوم بە دۆست و ئاشنا، لە کاتی هاتنی خاڵە نیو کاتیک تێپەربو بەڵام خاڵە دیار نەبو من زۆر پڕوش و نیگران بوم لە کاک حەسەن کە لەلای شانی ڕاستم دانیشتبو پرسیارم لیکرد: ئەوە خالە بۆچ نەهاتووە و دیار نییە؟ وڵامی دامەوە وتی : بە خووا منیش زۆرم پێ سیرە، قەت وا درەنگ نەهاتووە لام وایە ئیستا پیدا دەبێ ئاخر خاڵە هەمو ڕۆژیک هەتا نیویژی ئیواری لە ماڵەوە نەکات دەرناکەوی. ئەمجار کابرا پرسیاری لەمن کرد و وتی : کاکە لام وایە تۆش هەروەک ئیمە ئۆگری وتەخۆشەکانی خاڵە ڕەجەب

بویـــت؟ وڵـــامم داوە و وتـــم : بـــەڵێ بـــرام منـــیش ئـــەوە ماوەیەکـــە ئـــۆگری خاڵـــە بومـــو حـــەز بـــە وتـــە خۆشـــەکانی دەکـــەم. لـــە کـــاتی خۆیـــدا خـــۆم دەگەینمـــە ئێـــرە لـــە پاشـــان ئـــەوّاوی باســـی خۆمبـــوّگێراوە ... . کـــابرا پیـــاویکی ویچـــوو زۆر زۆر موحتـــەڕم بـــو ئـــەمجار وتـــی : بـــراتم منـــیش هـــەروەک تـــۆ ئمـــە چەنـــد ســـاڵە بـــۆ ئیرەیـــان ڕاگویزیـــوم ئـــاخر منـــیش هـــەروەک تـــۆ ڕاســـپراوی ( کارمنـــد ) حوکمـــەتم. لـــە پاشـــان هـــەر دوکمـــان لـــە ناســـینی یـــەکتر گـــەلیک خۆشـــحاڵ بـــوین، دەســـتمان کـــرد بـــە وتـــوویژ و ســـەکاڵای ژیـــانی پـــڕ لـــە تەنگـــەو و چەڵمـــەی ڕۆژگـــار و ... . لـــەم کاتـــەدا بـــو کـــە خاڵـــە لـــە درگـــایی چایخانەکـــەوە ژورکـــەوّت وە یـــەک ڕاســـت هاتـــە لای ئیمـــە و چـــو لەســـەر جیّگاکـــەی خـــۆی دانیـــشت. لەهـــەمو لایەکـــەە خاڵـــەیان بـــە خیـــر هـــاتن کـــردو دەوری خاڵـــەیان گـــەمارو دا، خاڵـــەش لەســـەر خـــۆ و هیـــدی دەســـتی بـــە چـــاک و چـــووّنی لـــە هـــەمو مرۆڤـــەکانی کـــە لـــەلای دانیـــشتبو نـــو لـــە دەوری کۆببونـــەوە کـــرد و ئـــەمجار چایـــەکی خـــوواردە وە و دو مـــژی لـــە قەلیانەکـــەی داو دەســـتی بـــە گێرانـــەوەی مـــەتلی خـــۆش خـــۆش ئەونـــدەی قـــسە و بـــاس و وتـــەی خـــۆش خـــۆش بـــۆ گێرانـــەوە کـــە لـــە پێکـــەنین دەممـــان وەیـــەک نەدەکەوّتـــەوە، بـــە کـــورتی ئـــەو ڕۆژش هـــەر وّەک ڕۆژانـــی پێـــشو

ڕۆژمـــان ئـــاوا كـــرد وه كـــاتى خـــوا حـــافيزى پيگەيـــشت، گەشـــتمان وەک ڕۆژەكـــانى تـــر لـــە يـــەک جيـــا بونـــەوە ... بـــە كـــورتى ئـــەم جـــۆرە كـــۆ بونەوەيـــە ماوەيـــەكى زۆرى خايانـــد بڕادەيـــەک ئێـــواران خۆشـــمان بۆدەگـــوزەرا كـــە لـــە بيـــر و هۆشـــى هـــيچ شـــتيک دا نـــەبوين، هـــەمو ڕۆژى خـــوا خوامـــان بـــو زر ئێـــوارە دا بێـــت و لـــە دەورى يـــەكتر كۆبينەوە و خاڵە ڕەجەبيش بە قسە خۆشەكانى شادمان بكات.

ڕۆژى دوشـــەممە بـــو نيـــويژى ئێـــوارەم كـــرد و لـــە ماڵـــەوە بـــەرو چايخانەكـــە كەوتمـــە ڕێـــى، هەميـــسان هـــەمومان لـــە دەورى يـــەكتر كۆبوينـــەوە و چـــاوەڕوانى خاڵـــەمان دەكـــرد، هـــەر چەنـــد چايمـــان خـــواردەوە و قـــەليانيان كێـــشاو چـــاو لـــە دەرگـــاى چايخانـــە بـــوين بـــەڵام خاڵـــە نـــەهات و پەيـــداى نـــەبو گـــشتمان تـــاكو ئێـــوارى درەنـــگ چـــاوەڕوان بوينـــو دانيـــشتين بـــەڵام هـــيچ هـــەواڵيک لـــە خاڵـــە نـــەبو ... لـــە هـــەمويان زۆرتـــر مـــن پەرۆشـــى نـــەهاتنى خاڵـــە بـــوم لـــە ناچـــارى وەک ڕۆژانـــى پێـــشو لـــە يـــەكتر خـــوا حافيزيمـــان كـــرد و بـــە پرۆشـــەوە لـــە يـــەک جيـــا بوينـــەوە، ئـــەو شـــەوە مـــن هـــەر وەک شـــتيكى بـــانرخم لـــە دەســـت دابێـــت گـــەليک ناڕاحـــەت و پـــەرۆش بـــوم نـــەم زانـــى چـــۆن خـــەوتم و چـــۆن ڕۆژ بـــۆوە، بـــەيانى كـــاتى لـــە خـــەو هەســـتام ســـەرم زۆر

زۆر دەهێشا، هەر چۆنیک بو خۆم گەیاندە دایرەکەم و دەستم کرد بە ئیشو کاری ڕۆژانە، هەرچیکم دەکرد دەستم بۆ ئیشوکار نەدەچو، تەواى کات لە بیر و هۆشی نەهاتنی خاڵە دا بوم لە برئمە ئەوندە ئوگری متەڵە خۆشەکانی ببوم حەزم بەوە دەکرد دایمە لە لای بم، کاتی ئیش و کاری دایرە تەواو بو منیش دەرکەوتم یەک راست رویشتمەوە بۆ مالی بەبیٚ ئەوەی هیچ بخۆم خەویکی قورس دایگرتم و خۆتم، کاتی لە خەو هەستام بانگی ئیوارەی دا بو بە پەلە نویژەکەم کرد و بەرگم لە بر کرد بەبیٚ وچان خۆم گەیاندە چایخانەکە، هەر وەک ڕۆژانی پیشو هاوڵەکانم لە جیگای خۆیان دانیشتبون بەڵام نە خاڵە دیار بو نە کاک حەسەن، لە پاش سڵاو و چاکوچۆنی لەسەر کورسیلەکەم دانیشتم زۆرم چیٚ سەیر بو کاک حەسەن دیار نەبو، لە بر ئمە ئەم خاڵەی زۆرتر لە ئیمە خۆش ئەویست، هیچ ڕۆژیک نەبو لە کاتی خۆیدا لە پیش ئیمەدا نەیتە چایخانەکە زۆر لە بیری کاک حەسەن و خاڵە دابوم، لە دلی خۆم دا وتم لە هەر شونیک بن ئیستا خۆیان دەگەینە ئیرە، بەڵام ماوەیەکی زۆر بەسەر چو لە هیچیان هەواڵیک نەبو، تەواوی ڕەفیقەکانم هەر وەک من زۆریان پیٚ سەیر بو، باس باسی

نەهاتنی خاڵە و کاک حەسەن بو،هەر کامیان لە بابەتێکەوە باسی خاڵەیان دەکرد. کاک مولو وتی : ئەمە ماوەی سێ ساڵە لە بر خاڵە بۆ ئێرە دیم بەڵام قەت نەبو وەک دوینی و ئەمڕو خاڵە دیار نەبیتو وا جێگاکەی ئاوا چوڵ بێت نازانم ئەمە دو ڕۆژە چی بەسەر هاتووە، وا دیار نییە. لەم وتوویژە دا بوین کە کاک حەسەن لە دەرگایی چایخانەکە وەژۆر کەوت، زۆر بە پەرۆش و شپرزە، هات بۆ لامان و بەپلە سڵاوی کرد و بە خەمباری و کەزی لە لامان دانیشت، من خۆم پیرانەگیرا ڕوم تێکرد و وتم :« کاک حەسەن ئەوە بۆچی وا درەنگ هاتی؟ خۆ ئیمە زۆر دەمێکە چاوەڕوانی تۆ و خاڵە دەکەین؟» کاک حەسەن لە ناخی دڵەوە هەناسەیەکی ساردی هەڵ کێشاو و چاوەکانی پڕ بون لە فرمێسک زۆر بە خەمبارێوە وتی : « بە خووا براکان هەواڵێکی زۆر زۆر ناخۆشم بۆتان هێناوە بەڵام نازانم چۆن بۆتان بەگێرمەوە». تێکرا بە خەمباریۆە ڕومان کردە کاک حەسەن و لە دەوری کۆبوینەوە. کاک عوسمان وتی :« چی بووە برام، بۆ چی قسە ناکەی، چە بەسەر هاتیکە بۆمانی بەگێرەوە با بزانین چە هەواڵێک بۆمانت هێناوە؟» کاک حەسەن ڕەنگی بزرکابو سەری

داخست و وتی : «خاڵە ... خاڵە ڕەجەب.» من بەبیستنی ناوی خاڵە خورپەیک کوتە دڵمەوە. بە پەلە وتم :« خاڵە چی ... خاڵە چی بەسەر هاتووە؟» ئەمجار کاک حەسەن وتی : «مەگر ئێوە، نازانن؟» ئیمەش بە تێکرایی وتمان : «نە بخووا نە... هیچ نازانین. گەشتمان چاوەڕوانی هاتنی تۆ و خاڵە بوین» کاک حەسەن وتی :« خاڵەیان گرتووە بردویانە بۆ حەبس ئێستاش ئەوە لە گرتوخانە دایە. کاک ڕەحیم وتی : کاک حەسەن پیمان بڵی بەزانین خاڵەیان بۆچ گرتووە بۆ چی بردویانە بۆ گرتوخانە؟ کاک حەسەن ئەمجار پەشوی هاتەوە سەر خۆ و بە نەرمی وتی : « وەکو بیستومە دویکە کاتی ئێواری هەر وەک ڕۆژانی پێشو خاڵە نویژی ئێواری لە ماڵەوە دەکات و جل و بەرگەکانی ئەکاتە بەرو ڕێ ئەکەویت کە بۆ ئیرە بێت، بەڵام لە ناو بازار دا کەمێک ئیش و کاری بۆ دێتە پیش و ئەنجامی ئیشەکانی ئەدات، لە پاشان دەست ئەبات بۆ گیرفانی ئەڕوانی تەزبێحەکانی لە ناو گیرفانی دا نییە، هەموتان باش ئەزانن هەمو ڕۆژی لە کاتی دامزراندنی مەتەڵە خۆشەکانی تەزبێحە زەردە دەنک گەورەکانی بە دەستەوە ئەگرت و هێواش هێواش ئەی خولاندەوە ... جا خاڵە کاتی ئەزانی

تەزبێحەکانی لە ناو باخەڵی دا نییە بە پەلە ئەگریتەوە بۆ ماڵەوە بەهێواشی دەرگاکە ئەکاتەوە گوێی لە دەنگێک ئەبیت خاڵە زۆری پێ سەیر ئەبیت، هێدی هێدی ئەچێتە پێشەوە هەتا ئەگاتە بەر درگای هۆدەکە. کاتی لە قەڵشی درگاکە ئەڕوانی ناو هۆدەکە چاوی پیدەکەوی کە ژنەکەی ... ژنە بێ شەرمەکەی ... ژنە بێ شەرەفەکەی بە ڕوتی و قوتی خۆی خستوتە ناو باوەشی ئەحمەد، ئەحمەدی کوڕی مام هەباس ... لا حولە وە لا ... نازانم چی بڵیم.

کاک حەسەن ئەوندە زیور و ناڕاحەت بو، سەری داخست و ڕاوەستا .. کاک عەلی وتی : « کاک حەسەن، کاک حەسەن لە پاشان چی بو؟»

کاک حەسەن بە کەزییەوە سەری هەڵبڕی و روی لە ئیمە کرد و وتی : ئەم ژنە بێ ئابڕو و نا نەجیبە لە پاش بیست ساڵ ژیان لەگەڵ خاڵە، بێ شەرمانە خیانەتی بە خاڵە دەکات، ئەوین و دڵداری لەگەڵ ئەم هەتیوە ناپیاوە دەکات خووایە تۆبە هەزار جار تۆبە... . کاک حەسەن تۆزیک ڕاوەستا و فرمیسەکانی خاوین کردەوە و وتی : « بڵیم چی برام چی بڵیم چی ...» . سەری داخست. ئەمجار من پرسیارم لێکرد و وام وت : « کاک حەسەن

لە پاشان چی بوو؟» کاک حەسەن وتی :« وەکو دراوسێکان بۆمنی گێڕاوە .. خاڵە کاتی چاوی بەم کارەساتە دەکەویت، هۆشی لەسەر خۆی نامێنی بە هێواشی ڕادەکا بۆ حەوشە میلەیەکی قورسی ئاسن بە دەستەوە دەگریت و خۆی ئەخاتە ناو هۆدەکە. ئیمە دەبوواێ بکریت ئمە دیکات پیاوانە هەردوکیان بەیەکەوە ئەکوژیت لە ناو هۆدەکە پڕ دەکات لە خوینی پیسی ئەم خەیانەت کارانە، جا لەم هات و هاوارەدا دراوسێکان ئەڕژینە ناو ماڵی خاڵەوە خاڵەی بە دەستی خویناویەوە لەسەر تەرمەکان جیا ئەکەنەوە ... خاڵەش وەک مرۆڤیکی ئازا و بەشەرەف پیاوانە بە چەنگی خویناویەوە تەواوی ڕوداوەکە بۆ دراوسێکانی دەگێڕیتەوە و ئەمجار ماڵکەی بە یەکی لە داروسێکانی دەسپێری و ئەڕوا خووی تەسلیمی ڕاسپیراوەکانی حوکومەت دەکات. من ئەوندەم لە دەمی کاک نادری دراوسێیان بیست وە و بۆتانم گێڕاوە ... » ئیتر کاک حەسەن سەری داخست و دەنگی لێوەنەهات. کاتی ئیمە ئەم بەسەر هات و ڕۆداوەمان بیست بە تێکرایی خەمێکی قورس و گران دایگرتین. خەفەت بەری دڵمانی گرت، زۆر زۆر بەم باسە تێک چووین و ئاڵۆزاین، بەڵام کاک مەحموود ئیمەی وریا کردەوە

و وتــی :« خەفــەتی چــی ئــەخۆن براکــان ئــەبێت ئیمــە شــانازی بــەپیاوەتی و شــەڕەف و ناموســی خاڵــە بکــەین، خاڵــە پیاویکــە بــۆ پاراســتنی ئــابرو و شــەڕەف و ناموســی خــۆی ناپیــاو ژنــە چەپــەل و بــێ ئابڕۆکــە خــۆی کوشــتووە، ئــەبی بــەتێکرایی بــەچین بــۆ لای و پیرۆزبــایی لــی بکــەین». مــن بیــرم لێکــردەوە بەمیــشکم داهــات خاڵــە پیــاویکی بــە نــاو بانــگ و خــاوەنی ئــابڕۆ و ناموســە بــۆ خاڵــە مرۆڤیکــی بتــەواوی مــرۆف بــو، خاڵــە پیاویــک بــو کــە هــەزاران مرۆڤــی وەک مــن ئــەوینی مەتەڵــە خۆشــەکانی بــون ... بــەڵام ... بــەڵام لەگــەڵ ڕۆژگــار و ڕەوڕەوی دەوران چــی بڵــیم ئــابڕۆ و ناموســی هــەمو پیاویــک زۆرتــر لــە دەســتی ژن دایــە، لــە دەســتی هــاو ســەر و شــەریکی ژیــانی دایــە. ماوەتــەوە عــەقڵ و هــۆش و شــەڕەف و ئــابڕۆ ژنەکــە بــەتوانی پیاوەکــەی ســەر بــەرز بکــا یــا ســەرنەوی. زۆر زۆر خــەفت بــار بــوم بتــەواوی بەبیــستنی ئــەم ڕوداوە هۆشــم لەســەر خــۆم نــەمابو کەوتبومــە نــاو دەریایــەکی زۆر قوڵــوە ... لــە پــڕدا کــاک حەســەن قــاوی لێکــردم و وتــی :« لــە چــی بیــر دەکەیتــەوە. بــرام ژیــن چــەوتوو نالــە بــاری زۆرە، باشــتر ئەوەیــە بڵــاوەی بکــەین و لــە یــەکتر بــە کوڵــە بــاریکی خــەم و خەفــەت و نارەحــەتیوە لــە دەوری یــەکتر جیــا

ببینــەوە و هــەر وەک ڕۆژانــی پێــشو هــەر کەســەی بــەرو مــاڵی خۆمــان بکــەوین ڕێ.» لــە گەشــتیان خــەم بــارتر مــن بــوم ... نــەم زانــی چــۆن خــۆم گەیانــدەوە مــاڵی جــەلو بەرگــەکانم لــە بــر خــۆم دا مــاڵی و ڕاکــشام و چــاوم بــڕی بــر میچەکــە ڕوداوی ئــەم ماوەیــەم وەک پــەردەی ســینەما بــەبر چــاودا دەهــات و ئەڕویــشت وینــە خاڵــە ڕەجــەب دایمــە لــە بــر چــاوم بــو مەتــەڵوو قــسە خۆشــەکانی لــە نــاوگویم دا وەک موســیقای خــۆش و پــڕ ســۆزێ زرینگــاوە... . ماوەیــەک بەســەر چــو وەک بیــستم دادگــاه (مەحکەمــە) بــو خاڵــە ڕەجــەب مــاوەی پــانزدە ســاڵ حەبــسی بــۆ بڕیبــۆوە... ڕۆژیــک هێنــدیکم کەلوپــەل و دیــاریم بــۆ کــڕی و ڕۆیــشتم بــۆ دیتــەنی لــە پــاش ڕوخــسەت وەرگــرتن چومــە لای بۆنــاو هۆدەکــەی، کــە چــاوم بــە خاڵــە کــەوت ڕۆانــیم خاڵــە زۆر کــەیف خۆشــە و ســاخو ســەڵامەتە باوەشــم پێــدا کــرد و خــستمە نــاو باوەشــم لــە لای دانیــشتم خاڵــەش بــەدیتنی مــن زۆر زۆر خۆشــحاڵ بــو گــەلێک باســمان کــرد و زۆر زۆر پێکــەنین و زۆرمــان وتــوویژ کــرد. هــەتا ئــەو کاتــەی بــەڵین تــەواو بــو، لــەو حاڵــەش دا خاڵــە ئەوەنــدەی مــەتڵی خــۆش بــۆ گێرامــەوە خــۆم لــی ون بــەبو. کــاتی خــوا حــافیزی خاڵــە وتــی : « ئەگــەر ئــەمجار هــاتی بــۆ لام، بەتــەواوی بەســەر هــاتی

خۆمــت بــۆ دەگێڕمــەوە و ســڵاوی هــەمو دوستانیــشم بــۆ بگەیـنــە».
دەســتەکانیم مــاچ کــرد و وتــم :« بــە خــوڤا خاڵــە بەقــەدرای براکــانم
دڵـم بـۆ تــو زۆر خەمناکــە چونکــە منـیش دو بـرام هەیــە و زۆر دەمیکــە
لییــان بــێ هــەواڵم ئێــستاش تــۆم لــە جێگــای براکــانم دانــاوە».
چاوەکــانی مـن و خاڵــە پڕ بـون لـە فرمیـسک لـە هۆدەکـەی دەرکـەوتم.
خاڵــە هــاواری لێکــردم و وتــی : « براکــەم خــەمبار مەبــە ڕۆداوەی
ژیـان زۆرتــر بەســەر مــرۆڤ دا دیــت. قــەت خەفــەت مــەخۆ. مــن لــە
کــردەوەی خــۆم و چــارە نــوس زۆر ڕازیــم. لەبــەر ئەمــە شــەرەف و
ئــابڕۆی خــۆم نەخــستە ژێــر پــێ ... لــە بــەر ئەمــە خــۆم ســەر نــەوی
نــەکرد و ڕازیــم بــە ڕەزای خــوڤا...» مــن ڕەق ڕاوســتا بــوم لــەپاش تــەواو
بــونی وتــەکانی خاڵــە بــە داخــەوە خەفــەت بــار لــە خاڵــە جیــا بومــەوە
کــاتی لــە حەوشــەی گرتوخانەکــە دەرکــەوتم روم کــردە زەوی و تفــم
کــرد، لـە ژیـان تفـم کــرد لــە بێوەفــایی بــەعزیک و لــە دڵــی خۆمــدال
لەعنــەتم لــەو کەســەنە کــرد کــە ناپــاکن. ســەرم لــە کــردەوەی ڕۆژگــار
ماســی بــو، نــە زانــی چــۆن خــۆمن گەیانــدەوە ماڵــەوە... ماوەیــەکی
کــەش بەســەر چــۆ ڕەوڕەوی ژیــان هــەر وەک بــەرق بەرۆپێــشەوە
ئەڕۆیشت هەر شەو ئەهاتو ڕۆژ دەبۆوە...

ژیـان بەڕادەیـەک چـەوتو ناڵـە بـارە هـەر کـەس لـە بیـری خۆیـدا یـە. بـە قولیـک کـەس لـە بیـری کـەس دا نییـە. بـەڵام ژیـان بـۆ تاقمیـک شـیرین و بـۆ زۆر کەسـان تـاڵی تاڵـە زەمـان ڕاوەسـتانی نییـە، بـە هـەر جۆریـک بێـت بـەرو پێـشەوە ئـەڕواٰ تـو تیئـە پـەڕی... هـەتا ڕۆژیـک لـە وەرزی هاوینـدا بـو هەمیـسان هێنـدیکم کەلوپـەل کـڕی و خـۆم ئامـادە کـرد و ڕیگـای گرتوخانەکـەم داگـرت کـاتی گەیـشتمە بـەر درگـای گرتوخانەکـە مـاوەی کـاتێکم ڕوخـسەت وەرگـرت، چومـە نـاو هۆدەکـەی خاڵـە، لـە پـاش هـەواڵ پرسـین و چـاکۆو چـۆنی خاڵـە بـە گـورجی دەسـتی کـرد بـە دروسـت کردنـی چـایی،وە بـە دیتنـی مـن گـەلێک شـاد بـو دەسـتی خـستە نـاو دەسـتم و لـە لای خـۆی دانـامو وتـی : « کـاک حەسـەن و هاوّالـەکانی کـەش دویکـە هـاتن بـۆ لام و زۆر دانیـشتن و لـە پـاش ماوەیـەک ڕۆیـشتن» ئـەمجار مـن و خاڵـە دەسـتمان کـرد بـە وتـوویژ خاڵـە هەمیـسان دەسـتی کـرد بـە گێرانـەوەی مەتـەڵو قـسەی خـۆش خـۆش بـۆ ڕۆنکـای دڵـی مـن گاڵتـە و گـەپی دەسـت پـێ کـرد بـەڵام مـن وّام هەسـت پێکـرد کـە خـەم و خەفەتێکی زۆر لە ناو دڵی دا کۆبۆتەوە و ... .

چایەکە ئامادە بوو، خاڵە دوچایی تێکرد و لە لام دانیشت ئەمجار لە منی پرسیار کرد و باسی چایخانەکەی بۆ بگێرمەوە وتم:« بە خووا لە ڕۆژەوە کە تۆ لە بەندیخانەدای من ڕوم نکردۆتە چایخانەکە لە بەر ئەمە جێگاکەی تو چول بو، دڵخۆشی بۆ ئیمە نەمابو، ئیمەش رومان لە چایخانەکە نەکرد.» خاڵە ویستی دەست بکات بە مەتلْ و قسە خۆشەکانی بەڵام من وەبیرم هێناوە و وتم:« خاڵە تۆ بەڵینیت بە من دا ئەمجار کەهاتم بەسەر هاتی خۆتم بۆ بگێریتەوە.» خاڵە روی تێکردم و هەناسەیەکی سارد لەناخی دڵەوە هەڵ کیشاو وتی :« من لە سەر بڵینی خۆم ماوم ـ بەم جورە بەسەر هاتی خۆی بۆ من گێراوە ـ من ناوم خاڵەقە کوڕی قادری مام مەحموودم تەمەنم شەست و دو ساڵە کاتی لە دایکی خۆم بوم و هاتمە سەر دونیاوە وەک بۆمنیان باس کردو وە لە خۆشی من کە تاقانەبوم دایک و باوکم خەڵکیکی زۆریان لە خزمو و قەومان و دراوسێکان بۆ میوانی بانگ دەکەن و چوار شە و چوار ڕۆژ زەماوەند دەکەن، بە باشی وەبیرم نایت کە تەمەنی منالیم چۆن ڕابواردووە چۆنم تیپەر کرد، بەڵام اە تەمەنی دە یان یازدە ساڵی دا بوم کە باوکم ئازاریکی گرتبو وە لە ناو جێگادا

کەوت، هەرچی هەمان بو خەرجی دەرمانمان کرد، بەڵام چاک نەبۆوە و لە پاش ماوەیەک کۆچی دووایی کرد، تەمەنی دریژی بو تو بەجی هیشت، من مامەوە و دایکیکی لیقۆماو و بەستزمان و بیٚ کەس. هەر وەک لە پیشوە باسم کرد تەنیا من منالی دایک و باوکم بوم، لە پاش من منالی کەیان نەبو لە بەر ئەمە باوکم کریکاری دەکرد و دەستی کورت بو، فەقیر و هەژار بوین باوکم پاشەکەوتیکی وەهایی نەبو، لە پاش مردنی باوکم ماوەیەکی زۆری نەکیشا دایکم دەستی کرد بەکارکردنی ماڵان بو ئەوەی خوی و منی پی بەخیو بکات منیش لە تەمەنی کەم دا دەستم کرد بە کریکاری و هەمو ئیواران لە پاش تەواو بونی ئیش و کار بو خویندن دەرس ئەچومە مزگەوت لە لای مەلا عەلی دەرسم ئەخویند شەوانەش هەتا نیوە شەو لە بەر ڕوناکی چرا فتیلەیەک دا ئەنیشتم و خریکی دەرس و مشقەکانم ئەبوم، بەیانیانش زو ئەرویشتم بو مەیدان بو کریکاری دایکی هەناسە ساردم تەنیا ئاواتی ئەمە بو کە نەمر بایە و بو ڕوژیک زەماوەندی منی بە چاوی خوی بەدیبایە. بەڵام ئەوندە ماندو بو و چەوسایەوە، هەتا نەخوش کەوتو ئەم نەخوشیە وەک موتە پیوەی نوساو ڕوژ لەگەل ڕوژ

زەرد و زەلیل دەبو، زۆری نەخایاند ئەمیش لە شەویکی ساردی زستاندا کۆچی دووایی کرد،لە پاش مردنی دایکم هەمیسان من مامەوە و کۆڵە باریک خەم و خەفەت و هەژاریو تەنیایی و ... بەڵام لە دەرس خویندن دەستم هەڵ نەگرت. بە هەر جۆریک بو هەتا پلی پینجەم دەرس خوین، تەمەنم لە نوزدە ساڵان دابو تاق و تەنیا و بێ کەس و کار، بەم ئەحواڵەش کە هیچم نەبو بە مردنی دایکم ئەوەندەی کەش کەساس و لیقوماو بوم ... لە بەد بەختی نەمامم بو نە خاڵم بو نە برا، تەنیا چاوە خانویکی کۆن و ڕۆخاوم بۆمابۆو، ڕۆژانە کە لە کریکاری ئەهاتمەوە ماندو و مردو لە ناو هۆدەیەکی سارد و ڕەق و ڕوق شەوم ڕۆژ ئەکردەوە هەتا شەویک دانیشتم زۆرم لە خۆمو لە ژیان بیر کردەوە، وام بە باش زانی کە خۆم بە دڵخوازی خۆم تەحویلی سەربازی بدەم، لە بەر ئەمە دو قازانجی هەبو، یەکم تۆزیک چاوەکانم بکریتەوە و لە دەستوپێ سپیلکەی ڕزگار بم و بەبم بە مرۆڤیکی لێهاتو، دوهەم خەفەتی لە دەست دانی باوک و دایکم لە بیر خۆم برمەوە و لە بێکەسی ڕزگاربم، جا هەر ئەمە بو کە بیانی لەخەو هەستام و بە گورجی خۆم ئامادە کرد و ئیشوکارەکانی پیویستم زر ئەنجام دا و ...

سەرو نەهێشینم، ڕۆیشتم خۆم تەحویل دا ... ماوە دو ساڵی تەواو بە بێ کەم و زۆر سەربازیم کرد و خۆم ڕزگار کرد، لە سەربازی (عەسکەری ) هاتمەوە، زۆر زۆر گۆڕا بوم هەتا بۆ خۆم خۆم پێ سەیر بو، ببومە مرۆڤیکی ئازا و عاقڵ و ڕێک و پێک و زۆر کەیف خۆش و سەرە حال لە بەر ئەمە پینج کەلاسم سەواد هەبو، ماوەی چەند ڕۆژیک ڕاوەستام هەتا بە باشی حەسامەوە، ئەمجار بەڵگەی سەربازی و بەڵگەی خویندەوازی و بەڵگەی سەلامەتیم گرتبە دەستەوە دایرە بە دایرە (ئیدارە) دامزرام و دەستم کرد بە ئیش و کار ... لە بەر ئەوە لە مانگی ڕەجەب لە دایک بوم و لە مانگی ڕەجەب دا دامزرا بوم، ناوی خاڵە ڕەجەبیان بەسەردا دابڕیم بومە خاڵە ڕەجەب. دایرەی شارۆانی هەر چەند مۆاجبەکەی کەم بەڵام بۆ من زۆر باش بو، لە بەر ئەمە لە دەربەدەری و هەناسە ساردی ڕزگارم ببوم ماوەی دوسە ساڵ کارم کرد و پاشکەوتێکم وەلا نا، ئەمجار لەم پارەیە هێندیکم لە خانوکەم خەرج کرد و ڕێک و پێکم کرد، تازە ئەمە ویستم بەحەسیمەوە کە شەویک دراوسێکانم ڕژانە ماڵەکەم و کۆبونەوە و هەمویان خەوی ژن هینانیان بۆ من دیتبو، چارەنوس وای نوسیبو، لە پاش ماوەیەکی

کەم لەگەڵ کیژیک بە ناوی زارا زماوەندم کرد زارا زۆر ژنیکی باش و هەڵکەوتوبو، من زۆر زۆری لی ڕازی بوم بە بون و نەبون ڕازی بو، ماوەی بیست ساڵ ژیانم لەگەڵ کرد بەڵام بەقەزای خووا منالمان نەدەبو، تاوانی نەبونی مناڵ لە من بو زۆرم خۆ لە دار و بەرد دا زۆر چومە لای دوکتور زۆرم دەوا و دەرمان کرد بەڵام خووا منالی پێنەداین، هەر وەک وتم زارا ژنیکی زۆر باش بو زۆربە شەرەف و بە ناموس بو، ژیانیکی زۆر خۆشمان هەبو، کەم کوڕیکمان لە ژیان دا نەبو ئەوەی کە کەم بو تەنیا نەبونی مناڵ بو، لە پاش بیست ساڵ ژیانی ژن و مێردایەتی ڕۆژیک لە یەک جیا بوینەوە و ... هەمیسان من مامەوە و تەنیایی و بێ کەسی، ماوەیەکی زۆر تەنیا بوم، هەتا سەر ئەنجام توشم بە توشی ئەم ژنە بێ حەیا و نانەجیبە بو، بە دەست خۆم نەبو چارەنوس ئەو ژنەی لەسەر ڕیگام سەوز کرد، بەکورتی پێت بەڵیم ڕۆژیک لە ماڵی خات دولبەری دراوسێمان چاومان بە یەک کەوت و ئەو بێ وەفایە گەلیک سەکاڵای لە دەستی مێردەکەی پێشوی بۆ باس کردم بۆم دەرکەوت کە ئەمش هەر وەک خۆم بێ کەس و هەژارە ... ئەمجار منیش تەواوی بەسەر هاتی خۆم بە بێ زیاد و کەم بۆ

گێراوە،تەواوی پیشنیارەکانی منی بە گیان و دڵ قەبوڵ کرد، ڕۆژێک زۆر بە خۆشی و دڵ گەرمێەوە بە یکەوە زەماوەندمان کرد، لە بەر ئەمە ژنە لە ناو دڵما بە ڕاست و پاکی هاتبو بەر چاوم تەواوی ماڵ و سامان و بون و نەبونم خستە بەر دەستی، دایمە هەر وەک هەر دو چاوکانم پارێزگاریم لیدە کرد لە پاش ماوەیەکی زۆر کە تەمەنم بو بە پەنجاە ساڵ لە دایرە کە تەقاعودیان (بازنشستە) کردم منیش لە بەر ئەمە مەواجەبم هەبو و دڵخوشیم بە ژن و ماڵەکەم هەبو جەل و بەرگی جوواْنم لە بەر دەکرد و هەر وەک لاویکی سەرە حاڵ لەگەڵ ژنەکەم بە خۆشی ڕامان ئەبوارد و مانگ لەگەڵ مانگ پارەی تەقاعودیکەم وەر دەگرت و ئەم خستە ناو دەستی ژنەکەم بە یەکەوە زۆر بە خۆشی و بەختەوری ڕامان ئەبوارد، هەمو ڕۆژان لە پاش نویژی ئیواری ئەچومە ئەم چایخانە و لەگەڵ دۆست و ڕەفیقەکانم دەستمان دەکرد بە قسەی خۆش و گاڵتە و گەپ، ئیوارانیش بە دەستی پڕەوە ئەچومەوە بۆ ماڵی ... هەتا ئەو ڕۆژە ... ــ خاڵە هەناسەیکی ساردی هەڵ کێشاو ئەمجار وتی ــ کە چارەنوس ئەم کارەساتەی بۆ ڕێک خستم، ئێستاش ئەبی بە تەمەن و ڕیشی سپی یەوە ماوە

پانزدە ساڵ لە ناو حەبس دا ڕبویرم ... بۆ ماوە چەند دەقیقەیەک خاڵە ڕاوەستا و چاوەکانی پڕ بون لە فرمێسک .. ئەمجار وتی ـ کاکە گیان ئەمە بو بەسەر هاتی من و ڕۆداوەیی ژیانم چارەنوس ئەمەی لە ناو چاوانی من نوسیوە ...» کاتی وتەکانی تەواو بو من سەرم داخستو کەوتمە دەریایەکی قول و بێ بن، بێ وچان فرمێسکەکانم هەر وەک جوگەلەی ئاو بە چاوەکانم دا ئەهاتە خووار ... هەر ئەوەندەم وت :« تف لە هاواڵی ژیانی کە ئاوا بێ حەیا و بێ ... بێ » لەم کاتەدا ڕاسپێراوی گرتوخانەکە لە دەرگاکەی دا هاتە ژورەوە و وتی: « برام کاتی وتوویژ تەواو بو» دەرگاکەی کردەوە و چاوەڕوانی دەرکەوتنی من بو، خاڵە هەستایە سەر پێ منیش ڕەق ڕاوەستام، باشمان بە یەک دا کرد و دەستمان کرد بە گریان ... ئەمجار بە چاوی پڕ فرمێسکەوە لە خاڵە ... خاڵەی بە شەرەف، خاڵە ڕێک و پێک، خاڵەی قسە خۆش و گوڵی مەجلس جیا بومەوە و خووا حافیزیم لێکرد و لەناوهۆدەکەی گرتوخانەکە دەرکەوتم برو ماڵ کەوتمەڕێ...

بۆکان... جوزەردانی ساڵی ۱۳۶۹ هەتاوی

بەشی سی‌هەم

# حەمەلاو ٣

لە ڕۆژگارانی زۆر قەدیم دا، زەمانیک کە قەومی کورد بەڕادەی زانین و زانستی و تیگەیشتوی ئیمڕو نەگەیشتبو،فەرهەنگ و ئەدبیاتی زەبانی دایکیمان وەها لیقوماو ئاڵوز و ژیرکەوتوبو کە زۆر کەس ناوی مەکتب و تۆپ و تەیارە و ئوتومبیلی نەبیستبو، ئیش و کاریان خوواردن و خەوتن بو و لە ژێر چەنگی ڕەمەکی نەخویندەواری دا کاتی ژیانیان لەگەڵ ڕۆرەوەی زەمان بەسەر ئەبرد. سەریان داخستبو وەک مریشکیکی بێ کەس لە گەشت لاو، بەسەریان دادە دان، بەڵام شەرەف و ناموس و ڕەسنی پیاوەتی خۆیان ئەپاراست، لەم زەمانە دا بو کە تاقەمێک مل هۆر و تینەگەیشتو کە تەنیا نەترسی و ئازایەتان چە تفەنگیکی سەر پڕ و کۆنو چە پرک کە بەکرسەی ساچمە و باڕوت و کۆنە پەڕ و پڕیان ئەکرد ئەیانخستە سەر شانیان و خۆیان پێ ئەنواند و شانازیان پێ ئەکرد، ئەمجار بەم هۆیەوە دەستیان دەکرد بە ڕاوەڕوت و ڕەچان ئەم تاقمە ببونە مایەی ئەزیت و ئازاری بەشێکی زۆر لە خەڵکی ئاوایەکان هێرشیان ئەبردە سەر گوندەکان و دەستیان دەکرد بە تەقە و

هات و هاوار و ڕمبازین و بەدوری ماڵەکاندا ئەسپ تاو دان خەو و خواردەمەنیان لە خەڵکەکە حەرام دەکرد مەبەستیان لە پێک هێنانی ئەم ئاڵوزی و گێژاوە ئەمەبو کە لەم قومە فەقیر و بێ دەسەڵاتە بە زۆری باج بەستێنن کاتی ئەم تاقمە ناپیاوانە هێرشیان ئەبردە ناو ئاوایەک زۆر لە پیاوەکان و لاوە گەنجەکان لە ترسی کوشتن لە بن بەرد و بە ناری کێوەکان خۆیان حەشار ئەدا، ژن و منالکانیش خۆیان بە ژورەکان دا دەکرد و درگای حەوشەکەیان لەسەر خۆیان دا دەخست بەڵام تاقمەکە ئەست هەڵ گرنە بون لە سەر زینی ئەسپەکان دائەبەزین و بە زۆری و بە لەقە درگای ماڵەکانیان تیک دەروخاند و خۆیان بە ماڵەکان دا دەکرد و هێرشیان ئەبردە ژۆرەوە هەرچی کەلوپەلی بایخدار و بەکەڵک وەدەستیان ئەکەوەت ڕامالیان ئەدا و باری وڵاخەکانیان ئەکرد و ئەیان برد و بە قاقا و پێکەنین گوندەکەیان بەجی ئەهیشت و ... ئەڕویشتن، لە گوندی کێوەسور لە ناوچەی کوردوستانی ئیران کە گوندیکی سەرسەوز و خۆش و پان و پڕ لە خەڵکە پێشکەوتوتر لە گوندە پچوکەکانی دەوروبەری بو، لە برگەوڕەی و دەوڵەمەندی زۆرتر لە گوندەکانی تر دوچاری زر و زیان دەبو بە قولیک هەر کەس بانی زۆرتر بێ بەفری زۆرترە، دانیشتوەکانی ئەم ئاوایەش هەر وەک تاوایەکانی کە کاتێ

تاقمەکە هێرشی بۆ دەهێنان ئەوانیش بە وینەی گوندەکانی تر خەڵکەکە لە ترسان خۆیان حەشاردەداف حەمەلاو لاویکی جوامیر و چالاک و ڕێک و پێک بو زۆر لە برز چاوی خەڵکەکەبو. ئەمیش بەبیستنی دەنگی تەقینەوەی هەولین گولە ویڕای خەڵکەکە ڕای ئەکردو خۆی ئەخستە ناو دارستانەکە و وەلەژێر دارە مازویەکی پیری کۆنە ساڵ کە لەق و پەپیکی زۆری لی بڵاو ببۆوە ڕادەکشاو سەری نەخستە سەر زەوی چاوەکانی ئەبڕی لە ئاسمان و ئەچۆ ناو بیرەوە بیری لەکارە ساتەو زروڵم و زۆری ئەم تاقمە ناپیاوانە دەکردەو گلاڵەیەکی(نەقشە) لە ناو مێشکی دابو، بەڵام لە بەر ئەمە نە خوێندەوار بو نەی ئەزانی چۆنی داریژیت و خۆی و ئەم خەڵکە هەژارە لە دەستی ئەم تاقمە خوین خۆرە ڕزگار بکات لە پاش ڕاوڕوتی تاقمەکە و ڕۆیشتنی ئەمان ماوەیەک ئەماو و پاشان ئەگەڕایەوە بۆ گوندەکە و ناو خەڵکە، حەمە لاوگەلی ڕوژان کە ئیش و کاری نەئەبو لە ئاوایەکە دەر ئەکەوتو ئەڕۆیشت بۆ ژێر دارە مازۆکە و دائەنیشت و بیری ئەکردەوە و زۆر بیر لە چۆنیتی ئەم ڕۆداوە ئەکردەوە جار جار سەری هەڵ ئەبڕی پرسیاری لە دارەکە ئەکرد و ئەوت :« ئەی دارە پیرە تەمەنی تۆ لە تەمەنی من زۆر زیادترە تۆ دونیات لە من زۆرتر دیوە، زۆر لە پیاوانی ڕەشید و هەڵکوتو و ماقوڵ لە ژێر سیبەری تۆ دانیشتون

و حەساونەوە زۆر بێ ئاوی و گەرما و چەڵمەی ژیان چێشتووە، تۆ بەمن بەڵی من چە بکەم چۆن خۆم و تەواوی خەڵکی ئاوایەکان لە دەستی زوڵم و زۆری ئەم تاقمە خوێن خۆرە ڕزگار بکەم ئەی دارە پیرە من ڕێنمونی بکە هەوڵ هیوام خووایە و دوهەم ژێر سیبەری تۆ بەلکەم خووا پریشکەیەک نور بخاتە ناو دڵم و میشکەم یارمەتیم بدات، بەڵکەم بە توانم ئەم خەڵکە بێ تاوان و بێ گوناهە نە لەچەنگ ئەم تاقمە ڕزگار بکەم.» حەمە لاو گەیشت ڕۆژان لە ژێر دارەکە دائەنیشت و زۆری بیر ئەکردەوە بەڵام بە ئەنجام نەگەیشت ڕۆژیک هەر وەک ڕۆژانی تر حەمە لاو لە ژێر سیبەری دارە کە دانیشتبو لە ناخی دڵەوە بیری ئەکردەوە ڕاکشاو چاوەکانی تازە خەستبو سەریەک لە پڕ دا دو لاوی شۆخ و شەنگ دو لاوی بالا بەرز و دەم بە پێکەنین کە یەکیان ناوی سوارە بو وە ئەوەی کەش ناوی قاسم بو گەیشتنە لای حەمە لاو و لە زۆر سەری دانیشتن حەمە لاو چاوەکانی کردەوە ڕاست بوەوە دانیشت سوارە و قاسم دەستیان کرد بە پێکەنین و سڵاویان لە حەمە لاو کرد قاسم ڕوی کردە حەمە لاو و وتی: «ئەمە چیە؟ چی بووە چەت لیقوماوە لە بەر چی گەشت ڕۆژ ئیمە جی دەهیڵی و خۆت تەنیا دیتە ژێر ئەم دارە و خەفەت ئەخۆی و بیر ئەکەیتەوە نابێ ئیمەش بزانین؟» سوارە وتی:« حەمە لاو ناکات لە بیری دا

مەزراندنی بنەماڵە دا بێت و زەماوندت بەدەستەوە بێت وا لە ئیمەی حاشاردە ئەدیت؟ » حەمە لاو سەری هەڵبڕی و روی تێکردن و هەناسەیەکی ساردی هەڵ کیشاو وتی :« نە بە خووا، سوارەی خۆشەویستم من لە بیری ژن هێنان دا نیم لە بیری شتێکی کە دام دەردیکی لە مە گەورەتر لە ناخی دڵم دایە بەڵام نازانم چی بکەم و چۆنی بە ئەنجام بگەینم.» قاسم وتی :« حەمە لاو بۆچ بۆمانی باس ناکەی بەڵکەم ئیمەش بەتوانین لەگەڵت هاو بیری و هاوکاری بکەین بەیکەوە ئەم دەرد و چەڵمەیەی لە ناو دڵت دا یە بی تونینەوە» سوارە وتی:« ڕاست ئەکا برام مەگر ئیمە بەیکەوە ڕەفیق و دۆست و هاو ماڵ نین لە ناو گوندیک دا ناژین دەردی تۆ دەردی ئیمەشە، شادی و خۆشی تۆ شادی ئیمەشە.» حەمە لاو وتی :« بە خووا ئەوە ئیوە ئەڵین هەر وایە، بەڵام ئەم دەردە، دەردیکی قورس و گرانە» قاسم وتی :« حەمە لاو مەگەر نەت بیستووە دەڵین هەر دەردێک دەرمانێکی هەیە، ئیستاش بەفرمو بەزانین دەردەگەورەکەی کەلەناو دڵت دایە چیە؟» حەمە لاو سەری داخست و وتی: «من شەو و ڕۆژ لە بیری ئەمە دام کە خووا تاقەت و تەوانم بدات بە جوریک شەڕی ئەم تاقمە زۆر دار و نامردانە کە لەرێشە و ڕەگەزی خۆمانن بەم جۆرە ژیانیان لە ئیمە و تەواوی دانیشتۆکانی ئەم گوندە و ئاوایەکانی تر تاڵ کردەووە (

بەقەولیک دەڵین دار هۆرەی لە خۆی نەبێت ناقەڵاشی ) براکان خۆتان باش ئەزانن ئەم تاقمە بۆ ژیانی ئیمە بونەتە هۆرە و تاڵیمان بە گەرودا دەکەن خۆشتان لە من باشتر ئەزانن ئەم ناپیاوانە چەدەردیکمان پێ ئەدەن چۆن ئەم ژن و مناڵە بێ گوناهانە ئەزیت و ئازار دەدن ئیستاش من شەوو ڕۆژ لە بیری ئەمە دام تەواومان چۆن یەکتر بگرین و بە بینە تۆپەڵەیکی قورس و گران و خۆیان بە گژدا کەین، شەڕ و بەلایان لەسەر خۆمان لا دەین». قاسم وتی :« ئەوە ئەڵی چی کابرا، مەگر شێت بویی ئەمان تاقمەیکن تفەنگیان هەیەو خەنجەریان هەیە و ئەسپ و وڵاخی باشیان هەیە کی ئەتوانی بەربەرەکانی لەگەڵ ئەوان بکات مەگر تۆ مناڵی یان خوای نەکردە عەقڵت گۆڕاوە ... » سوارە وڵامی دایەوەو وتی :« ڵام وایە قاسم تۆ مناڵی .» وتی:« تی نا گەیت، ئەگر ئیمە تەواومان یەک گرتوبین و نەترسین و یەک بگرین، هەزار تفەنگو خەنجەر و ئەسپ و وڵاخ لە ئیمە کاری نابێت ، سەد تاقمی وە ها مەلهۆر لە ناو ئەبین بە هۆمیدی خووا.» حەمە لاو وتی:« ئافرم بژیت کاک سوارە ئەوەی وتت ڕاستە ئەمەیە، بەڵام چۆن ئەبێت؟ چۆن کاریکی وەها بکەین تا کو خەڵکەکە نەترسن و یەک گرتوکەین، ئەمجار لە هێرشی تاقمەکە خۆیان حەشار نەدەن و خۆیان ڕاگرن بۆ پاراستنی شەرەف و

ئەسپارد لە بەر ئەمە تەواوی خەڵکی ئاوایی کێوە سور و گوندەکانی دەوروبەر کۆببونەوە تەواوی سەر کێوەکە و دامینی کێوەکەیان داگرتبو، جێگا نەمابو، قاسم ڕویشتە سەر بەرزایەکی بەڵیند و ڕاوەستا و لە تەواویان گەلیک سوپاسی کرد و ئەمجار باسی یەکەتی و یەک گرتویی و چالاکی حەمەلاو و سوارەی بۆ کردن کە بۆ لەناو بردنی ئەم تاقمە زۆردار و باج گر و مل هۆڕانە چە شەوان و ڕۆژان دانیشتبون و گلاڵەیان کێشابو، باسی نەبونی و کەساسی و نەخواردن و لیقوماوی لە ماوەی ئەم دو ساڵ خویندنەی بۆ کردن، باسی ئاوات و ئارەزوی ناو دڵی سوارە و حەمەلاوی بۆ کردن و ... .

لە پاش ماوەیک زۆر وتوویژ و شین و گریان و فاتیحا خوانی ئەمجار قاسم لەگەڵ خەڵکەکە بەر و مزگەوتی ئاوایی کێوەسور کەوتنە ڕی ... . سەرە خۆشیکەیان ماوەی حەتویەکی خایاند، لە تەواوی ئاوایەکان بۆ سەرەخۆشی و سوپاس لەم پاڵەوانانە کە زوڵم و زۆری ئە» تاقمە ناپیاوانەی لەسەر تەواوی ئاوایەکان لا برد، لە پاش فاتیحەخوانی بە تێکڕایی ئەچونە سەر گۆڕی حەمەلاو و سوارە و ئەحمەد بۆ ڕۆحی پاکی ئەم سی لاوە دوعایان ئەکرد ... .

ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەم ڕوداوە دا تێپەری هیواش هیواش خەڵکەکە بەرگی ڕەشیان لەبەر خۆیان دا مالی . ناوچەکە ئارام و بێ چەڵەمە بێ دەرک و مل هۆڕ بو، خەڵکی بە دڵگرمی خریکی ئیش و کاری کەشت و کاڵ و بەرهەم دەست کەوتەکانی خۆیان بون. سیبەری ڕەش و نالەباری شێرکۆ و تاقمەکەی لە تەواوی ناوچەکە دا خۆی پێچا بووە و ئاوا ببو ڕۆژیک لە پاش نویژی ئیوارە مام ڕەحمان هەستایە سەر پی و وتی : « براکان ... براکان داواتان لی ئەکەم بەچەن بە شوین خەڵکی ئاوایەکانی دوروبەر داوایان لی بکەن کە بۆ خواردنی نانی نیوەڕوی ڕۆژی هەینی گەشتیان میوانی من بن لە ناو مزگەوتە لەگەڵ میوانەکان نان ئەخۆین و دو مەبەستەم هەیە بە تەواوتان ڕاگەینم.

ڕۆژی هەینی تەواوی دانیشتوکانی گوندی کێوەسور و میوانیکی گەلی زۆر لە ئاوایەکانی دەوربەر کە هاتبون لە ناو مزگەوتەکەدا کۆبونەوە و خەڵکە ئەوندە زۆربون بەشیکی زۆر لەبەر هیوانی مزگەوتەکەدا دانیشتبون لە پاش نویژی نیوەڕو و نان خواردن، مام ڕەحمان کە خاوەنی میوانیکە بو هەستایە سەرپی و باسیکی زۆری لەبابەت ڕینمونی کردنی حەمەلاو و سوارە و قاسم بۆ یەک گرتن وەیەک گرتویی، خەڵکە ئاوایەکان لە ناو چونی شیرکۆ و تاقمە مل هۆڕەکانی و شەهیدبوونی سی لاوی

خێر و خۆشی لە خۆنەدی بۆ کردن ... ئەم جار بەدەستەکانی خۆی عەبا و میزەری ماموستایەکی کە لە پێش ئەم کۆبونەوەیە دا ئامادەی کردبو بەسەر شانی قاسم دادا و خەڵکەکەش بە تێکڕایی ماموستایەتی قاسمیان قەبوڵ کرد و پیروز بایان بە دەنگی بەرز لە قاسم کرد، ئەمجار دەستیان کرد بە شاد و چایی قەنداو خواردنەوە و زۆر زۆر سوپاسیان لە خوای گەورە و میهربان و مام ڕەحمان کرد، لە پاشان مام ڕەحمان ئامینی کچی خۆی پێشکەش ماموستا قاسم کرد و داوای لە خەڵکی ئاوایی کێوەسور و تەواوی گوندەکانی دەوروبەر کرد کە مناڵکەنیان بۆ فیربونی خویندەواری و زانیاری بۆ لای ماموستا قاسم بە نێرن تاکو لە چەڵەمەی نەزانین و نەخویندەواری ڕزگار بن، لە پاشان ماموستا قاسم سوپاسیکی زۆری لە کاک ڕەحمان و تەواوی خەڵکەکە کرد و ئەمجار لە هەوەڵین ڕۆژی ئاشنایی و پێکەوەبونی لەگەڵ حەمەلاو و سوارەوە ئەو پیمانەی وا لە ژیرداره مازو پیرەکەیان بەستبو بۆ لە ناو بردنی شیرکۆ و تاقمەکی بتەواوی باس بۆ کردن. وتوویژەکانیان هەتا ئێواری خایاند لە پاشان خەڵکەکان زۆر باش ڕون بونەوە و تەواوی تامی یەک گرتەنیان چێشتبو و بۆیان دەرکەوت ئەگەر گەشتیان پاڵ دنە پاڵی یەک و یەکتر بەگرن هیچ دوژمەنیک ناتوانی کاریان لیبەکات دەتوانن بە ئازادی و

سەربەستی بژین و دەست کەوتەکانی خۆیان کە بە بەدبەختی و ڕەنج و هەژاری وەدەستی دەهێنن بۆ خۆیان و منداڵەکانیان بێت، ئەمجار میوانەکان هەستانە سەر پێ و سەر و چاوی ماموستا و خەڵکە ئاوایی کێوەسوریان ماچ کرد و بەرو ئاوایی و ماڵی خۆیان گرانەوە ... ئێستاش ئەم کەسانەی ڕی یان ئەکەویتە ئاوایی کێوەسور لە سەر کێوە بەرزەکەوە لە ژێرداره مازو پیرەکە چاویان بە سێ گۆڕی زۆر کۆن ئەکەویت و لە بن کێوەکە ڕادەوستن و فاتیحایان بۆ ئەخوینن و داوای عەفویان لە خووا بۆ داوا ئەکەن... .

بۆکان جۆزەردانی ساڵی ١٣٦٦ هەتاوی

مەبەست لە چیرۆکە:-
١- ڕێگردن
٢- گیانی فیداکاری
٣- خوێندن
٤ خۆ ئامادە کردن
پەیام بە خۆکوشتنە وەی سوارە داستانەکە ئەم شێوەی
پاش لە ئیسلامدا خۆکوژی شەهید نییە

بەشی چوارم

# سەفەر



وەرزی پاییز بو، ئاسمان هەر ڕۆژە بە جۆزێک خۆی پێشان دەدا، هەورەکان لە هاتوچودا بون، ڕۆژێک تەواویان لە لایەک کو ئەبونەوە، ڕۆژی کیش گەواڵ گەواڵ و بەیانانیش دەستیان دەکرد بە هاواڕ و گرمە، دەیان گرماندو لەم هاواڕ و گرمەیە چەند دلۆپێک باران لە هەورەکان جیا ئەبونەوە و زەوی تۆزێک تەڕدە بو، بۆنی خۆشی باران و زەوی تینو تێکەڵ دەبون و بۆنەکە بڵاو دەبووەوە گەیا سەوز و جووانەکان ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ سەوزایی و جوانی خۆیان لە دەست دەدا و بەرو زەردی و بێ هێزی ئەچون. گەڵای دارەکانیش لەبەر ئەوە هێزو تاقەتێکی وایان نەمابو زۆربەشیان زەرد بوون بەناقایلی لە دارەکان جیا دەبونەوە ... چیا بەرز و سەرسەوز و جوانەکان کە لە وەرزی بەهار و هاوین دا سەیران گای لاوەکان و زۆر لە بنەماڵەکانی دانیشتوانی شارەکەمان بو زەمانیک پڕ لە گوڵی میلاقە و سوسین و هەڵاڵە و بیبون بون وەهایان لە هاتبو وەهاڕوت ببونەوە کە کاتی ئادەمیزاد و پلەوەرکان چاویان

پیدەکەوت بۆ سویان لە دڵ هەلدەستا و خەمناک دەبون، جا لەم وەرزە نالەبارەدا کە دایکی منداڵەکان پێشنیاری ئەم سەفەرەس پێکردم، منیش لەبەر بێ تاقەتی خۆم زۆر بی مەیل نەبوم کە چەند ڕۆژیک لە ماڵ و منداڵەکان دور کەومەوە و تۆزیک بیر و هۆشم لە دەست ژیانی پڕ لە تەنگە و چەڵەمەی ڕۆژگار و ڕۆژانە بحەسیمەوە، جا هەر ئەمە بو خووا یارمەتی دام بە زویی ئیش و کارەکانم جەم و جۆر کرد و خۆم بۆ ڕۆیشتن ئامادە کرد زۆری نەخایاند ڕۆژی ڕۆیشتن پێگەیشت لە پاش ئامۆژگاریکی زۆر بە منداڵە بەد فەڕەکانم و دایکی منداڵەکان جانتاکەم هەڵگرت و خووا حافیزیم لی کردن و لە ماڵەوە دەرکەوتم، بەڕادەیەک بۆ چونی ئەم سەفەرە خۆشحاڵ بوم کە مەپرسە، کاتی سواری ئوتومبیلەکە بوین و کەوتینە ڕی وە لەناو شاردا دەرکەوتین هەریەک لە موسافیرەکان لەگەڵ دانیشتوی لای شانی خۆی دەستیان کرد بە وتوویژ، ناو ئوتومبیلەکە لە بەرهات و هاواری خەڵکەکە وەهای لی هاتبو هەر وات ئەزانی لە ناو بازاڕی سەوزی فرۆشەکان دایی و خریکی کڕینی کەلوپەلی پێویستی ڕۆژانەی ... کەس لە کەس حاڵی نەدەبو هەر کام لەوانە باس و پێشنیاریکی بۆ ئەویکە دەکرد، منیش سەرم داخستبو و بیرم لەم چەند ڕۆژە

حەسانەوەی خۆم ئەکردەوە هەزار گەڵاڵەم لە ناو دڵ و مێشک دا بو کە بە ئەنجامی بگەینم ... ماوەیەکی زۆر ڕویشتن هەتا گەیشتنە بەر چایی خانەیەکی گەورەی ناو ڕێگا ئەمجار ئوتومبیلەکە ڕاوەستا و شاگر شوفیرەکە بەدەنگی بەرز هاواری کرد فەرمون وەرن بۆ خواردەوە نان و چایی بەخۆین ئیمەش گەشتمان بە تێکڕایی لە ناو ئوتومبیلەکە دابەزین و ڕۆیشتینە ناو چایی خانەکە، من وام بە باش زانی لە بەرەوە بەچم تۆزیک دم و چاوم بەشوم، خۆم بەحسینمەوە و لە پاشان بۆ نان و چایی خواردن ئامادە بم، کاتی گڕامەوە بۆ ناو چایخانەکە تەماشام کرد تەواوی میزەکان گیراونەوە، تەنیا کورسیلەیەکی پچوک لە قولینچکیک بەتاڵ ماوە منیش بە گورجی ڕۆیشتم لە سەری دانیشتم و جیگای خۆم گرتەوە بتەواوی جیگاکەم گەرم دانەهێنابو لە پڕدا کابرایەکی ورگ زل و مل ئەستوری سورهول چاوەکانی زەق و شین و سمێل زل کەسەبیلەیەکی دریژی بەدمەوە گرتبو لیم پەیدا بووە کورسیلەیەکی ڕویی بەدەستەوە بو هاتو لە سەرمیزەکەی ڕوبەروی من دانیشت بە بی هیچ سەرەتایەک ڕویی تێکردم و وتی : « برام تۆ زماوەندت کردووە، ژنەت هەیە » من زۆرم پی سەیر بو، لەم پرسیارە لە بەر ئەمە من

سی یان چوار کات لە مەو پێش لە ژن و منداڵەکانم جیا ببومەوە بە دڵم دا هات لە بەرخۆمەوە وتم ـ خوواى نەکردە لەم ماوەیە دا ژن و منداڵەکانم توشى چەلەمەیەک نەبوبین ـ هۆشم لەسەردا نەما، گویم لى بو کابرا پرسیارەکەی دوپاتە کردەوە و ئەمجار پرسى و وتى : « برا تۆ ئیشەت چییە؟ » من کە تازە هۆشیار ببومەوە، وتم : « چى چیت فەرمو؟» کابرا وتى پرسیارم کرد تۆ چى ئەکەیت و چەکارەیە؟ لە لایەک خەمى ماڵەوەم لە دڵ دا بو لە لایەکیش زۆرم برسى بو لەم لایەوەش ئەم کابرایە وەک بەڵا توشم ببو، بەرى چاوەکانم تاریک بون و بە تورەیەوە وتم : « بۆ چى ئەپرسى» کابرا وتى : « بۆ هیچ هەر وەها پرسیارم لیکردى» منیش بەسەر دمم داهات و وتم : « من چیرۆک نوسم » کابرا وتى : « نەى ژن و منداڵت هەیە» من وڵامم دا و وتم : « نەخیر نیمە » کابرا وتى : « من ... ـــ تۆزیک ڕاوەستا و لە پاشان هەناسەیکى ساردى هەڵ کێشا و دریژەى دا ـ برام من ژنم بو .... ژنیکى جووان و پاک و لەبەر دڵان بو ... بەڵام ... ـــ کابرا ڕاوەستا و هەر وەک دەریایەکى خەم لە ناو دڵى دابێت و بیهەوى لەگەڵ یەکى دەردى دڵ بکات . سەرى داخست و ... ـــ من زۆرم بەزەیى پێدا هات برسێتیم لە بیر چووە، ڕوم تێکرد و وتم : « بەڵام چى

ژنەکـەت چـی بەسـەرهات؟ » کـابرا بـە ئاسـپایی سـەری هـەڵبڕی و وتـی : « ژنەکـەم مـرد، ژنەکـەم کـوژرا ـ کـەمی مـات بـو وتـی ـ بـەڵی بـرام ژنەکـەم کـوژرا ...» مـن زۆرم ئـەم باسـە پـێ سـەیر بـو خـۆم جـەم و جـۆر کـرد و سـەرم بـەردە پێـشەوە و وتـم : « کـوژرا؟ کـی کوشـتی ئـاخر لـە بـر چـی ؟ » کـابرا مژیکـی تونـدی لـی سـەبیلەکەدا و وتـی : « مـاوەی شـەش سـاڵ بـو مـن و ژنەکـەم ژیـانیکی پـڕ لـە ئاسـایش و خـۆش و بـی تەنگـەو چەلەمـەمان هـەبو، ژنەکـەم زۆر بـاش و وریـا و پـاک و خـاوین بـۆ مـەن و ماڵەکـەمان بـو، یەکتریـشمان زۆر خـۆش ئەویـست، بـەڵام داد لـە دەسـتی ڕۆژگـار ... » لـەم کاتـەدا شـاگردی چایخانەکـە هـات بـۆ لامـان و وتـی : « چـی دەفـەرمون بۆتـان بـەهێنم » مـن وتـم : « ئـاو و گۆشـت » کـابراش وتـی : « منـیش ئـاو و گۆشـت ئـەخۆم » لـە پـاش ڕۆیـشتەنی شـاگرد چایخانەکـە ، کـابرا وتـی : « بـەڵی مـن و ژنەکـەم شـەش سـاڵی تـەواو بەیەکـەوە بـوین، هـیچ کـەم و کۆڕیکمـان نـەبو، هـەتا شـەویک، نیـوە شـەو بـو خـەوتبوین، لـە خـەوی شـیرین دا بـوین لـە پـڕدا ژنەکـە لـە خەوکـە دازریکەیـەکی لێپیـدا بـو هـاوڕای کـرد سـابیر ... سـابیر ـ ئـاخر مـن نـاوم سـابیرە ـ وەهـای قیژانـد کـە مـن لـە خەوەکـە ڕاپـەڕیم لەسـەر جێگاکـەم قـوت بۆمـەوە و بـە گـۆڕجی چراکـەم داگیرسـاند و ڕواڵـەتی ژنەکـەم تەماشـا کـرد

وەهـا سـپی ببـۆ وە ڕەنگـی بەڕویـەوە نـەمابو، زۆر سـەیر بـەرزكابو مـن ڕوم تێكـرد و وتـم ـ هاجـەر ... هاجـەر چییـە چـی بـووە؟ وتـی ـ سـابیر كـابرا كابرایـەكی ناپیـاو هـاتبو مـن بـەكوژی، بـەڵی هـاتبو مـن بـەكوژی، مـن لـە ناچـاری بـەدم پێكەنینـەوە وتـم ـ ژنەكـە گیـان كـابرای چـی و كوشـتەنی چـی؟ تـۆ خـەوت دیـوە، ژنەكـەم وتـی نـا ... ئەگـەر زو خـەبرم نەبواِیـەوە بـە خـووا ئەیكوشـتم ـ مـن وتـم ـ ژنەكـە بیكـی بـۆ خـاتر خـووا واز لـەم كارانـە بینـە، نیوەشـەوە و بـە خـووا خـەوت دیـوە، بابخـەوین باشـترە . ژنەكـە وتـی نـا ... نـا سـابیر تـۆ بەڕاحـەتی بخـەوە، بـەڵام مـن هـەتا ڕۆژ دا ئەنیـشتم، بـە خـووا خـەوم لـی ناكـەوی و ناخـەوم ...» ئـەمجار كـابرای كـە نـاوی سـابیر بـو وتـی: « بـەڵی كاكـەگیان سـەرت نەهێـشینم زانـیم نـاتوانم بەربـەرەكانی لەگـەلی بكـەم لیفەكـەم بەسـەر خـۆم دا كێـشا و خـەوتم، كـاتی بـەیانی خەبـەرم بـووە ڕوانـیم هاجـەر لەسـەر جێگاكـەی خـۆی دانیـشتبو و لیفەكـەی بـە دەوری خۆیـدا پێچـابو بـەڵام لەبـەر خۆیـەوە دەسـتی كـرد بـە ورتـەورت. منـیش زۆرم پـێ سـەیر بـو هەسـتام دانیـشتم هەمیـسان دەسـتم كـرد بـە دلخۆشـی دانـەوەی، وتـم ژنەكـە گیـان دایكـت چـاك بابـت چـاك واز بێنـە، تـۆ ژنیكـی ژیـر و عـاقلی خەوت دیـوە كـی ئـیش و كـاری بـەتۆ هەیـە كـی تـۆ ئـەكوژی لەبـەر چـی

ژیان لە خۆت و من دەشێوینی، داوا دڵ نیگران و ئاڵۆزاوی، هاجەر گیان هەستە، هەستە نان و چایی بەیانیم پێ بدە هەتا بڕوم بۆ ئیش و کار، ژنەکەم هاتە جوواب و وتی بە خووا کابرا ئەوەی من دیم خەون نەبو من ئەوەی وتم تۆش باوەڕناکەیت، من خۆم باش ئەزانم ڕۆژیک هەتا تۆ لە ئیش و کار دیتەوە من بە دەستی ئەم پیاوە نامەردە ئەکوژریم. من وتم ئاخر پیاوی چی ئەو پیاوە کی یە و چە جۆر پیاویکە ئایا من یا تۆ لەبارەی ئەودا ناحەقیکمان کردو وە ئایا چاوت بە پیاوە کەوتووە، یان ئەیناسی کی یە ژنەکەم سەری داخست و وتی نا ... من وتم کەوا تە تۆ لەسەر هیچ خۆت ئازار دەدیی و ژیان بەخۆت تال ئەکەی وا باشە ئەم بیرە چەپەڵ و ناحەزە لە دڵ و مێشکی خۆت دور بکەیتەوە و ...» لەم کاتە کە کابرا ئەم قەسانەی بۆم دەگێراوە شاگردی چایخانەکە ئاو و گۆشتەکانی هێنا و لەسەر میزەکەی دانا.

من کە زۆرم برسی بو بە بێ وچان دەستم کرد بە خواردن، بەڵام کابرا هەر وەک برینی حەوت ساڵی تازە ساریژ بو بێ دەمی گەرم داهاتبو بە بێ وچان لە بەر خۆیەوە قسەی دەکرد، منیش گویم بۆ شەل کرد بو پیتا پیتا پارۆکانم ئەخستە ناو دمم و بەلیم بۆ ئەوت، کابرا وتی : « کاکی خۆم ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو

شـــەوەدا تیپـــەڕی بـــو، بـــەڵام ژنەکـــەم ڕۆژ لەگـــەڵ ڕۆژ کزتـــر و لـــاوازتر ئەبو هـــەر چەنـــد باسـم بـۆ دەکـرد و پـیم ئـەوت ئەمـە فیکـر و خەیاڵـە بـە خـــوۆا هـــیچ جۆرکـــاری گرنـــەبو ... هەمیـــسان شـــەویک هـــەر وەک ئـــەو شـــەوە لـــە نیـــوە شـــەو دا زریکـــە و هـــاوۆاری لـــی پەیـــدا بـــو کـــاتی مـــن ڕاپـــەڕیم و لـــە خەوکـــە ڕاســـت بومـــەوە چراکـــەم داگیرســـاند چـــاوم پێکـــەوت ژنەکـــەم ئـــەمجار لـــە جـــاری پێـــشو زیـــاتر ڕەنگـــی بزرکـــاوە و بتـــەوۆاوی لەشـــی دەلـــەرزی، شـــانەکانیم گـــرت و ڕام وەشـــاند، هـــاوۆارم کـــرد هاجـــەر ... هاجـــەر ... تۆزیـــک هاتەوەســـەر خـــۆ کـــاتی چـــاوی بـــە مـــن کـــەوت خـــۆی کێـــشا بـــۆ دووۆاوە دەســـتی کـــرد بـــەگریان بـــەدەم گریانـــەوە ... ئـــەی وت مـــەم کـــوژە ... مـــەم کـــوژە، مـــن بـــێ تـــاوۆانم منـیش زۆرم پـــێ ســـەیر بـــو وتـــم کـــی تـــۆ ئـــەکوژی بـــە تـــاوۆانی چـــی لـــە بـــەر چـــی وۆا ئەکـــەی ژیانـــت بـــەمن و بـــە خـــوۆت کردۆتـــە جەهـــەننم، ژنەکـــەم تۆزیـــک هاتەســـەر خـــۆ ، چاوەکـــانی لـــەمن بـــەڕی و وتـــی کـــابرا ... کـــابرا هـــاتبو ئـــەمجار بەیـــەک جـــار مـــن بـــەکوژی ... مـــن زۆرم بـــەزەیی پێـــدا هـــات چومـــە بـــەرەو و وتـــم ژنەکـــە بیکـــە بـــۆ خـــاتری خـــوۆا و پیغەمبـــەر (ص) کـــابرای چـــی و کوشـــتنی چـــی مـــن ئـــەوە نییـــە لـــە ماڵـــەوە خـــەوتوم بـــە خـــوۆا نەکـــەس هـــاتووە و نـــە هـــیچ باســـێک هەیـــە، هەمیـــسان خـــەوت دیـــوە، ژنەکـــە هـــەر وەک شـــەق شـــەقە ئەلـــەرزی. وتـــی نـــا ... نـــا ...

پیاوەکە بە خووا کابرا هاتبو بەم کوژی من بە چاوی خۆم دیم من سەرم سورمابو نەم ئەزانی بەم نیوە شەوە چی بکەم و ڕو لە کویی بکەم، ناچار بوم لە لای دانیشتم خەوتەنم لە بیر چۆوە و دەستم بە ڕاویژ و دلداری دانەوەی کرد، بەلام ژنەکەم چاوەکانی زەق بەبون و ڕەق ڕاوەستابو و چاوی لە قولینچکی هۆدەکە بڕیبو زۆری بەسەر دا هاتم، هەتا هیدی هاتەوە سەر خۆ ... هیواش هیواش ڕۆژ بۆوە، ژنەکە تۆزیک بوژایەوە و سەماوەرەکەی داگیرساند و ڕۆژ ببۆوە بە تەواوی ولات ڕوناک بو، هیچی وای بۆ خۆرهەلات نەمابو» کابرا تۆزیک مات بووە ڕاوەستا منیش چاوەڕوانی ئەمە بوم کە بزانم ئاخری ئەم باسە و کارەساتە بە کویی دەگات، جا ئەمەبو بە دەنگی بەرز بە کابرام وت : « لە پاشان چی بو ژنەکەت چی بەسەر هات» کابرا هیندیکی نان خوارد و ڕاوەستا و هەناسەیەکی بە توندی هەلکیشا و وتی : « ماوەیەکی کەش بەسەر چو ژنەکەم وەک جاران هاتبۆوە سەر خۆ من لە دەلی خۆما وتم ئەوخەی خووا ڕەحمی بە ئیمە کرد و ژنەکەم لەم خەوە ناجۆرە و ئالۆزاوانە ڕزگار بو، بەلام بتەواوی دیاری ئەکرد کە ژنەکەم خەمیکی قولْ و تاریکی لە ناو دلی دانیشتووە، بەلام لە لای من نای دەرکینی، ئەم خۆشیە کاکە

گیــان مــاوەی مــانگیکی خایانــد، هــەتا ڕۆژیــک بــەیانی نــان و چــاییم خــوواردو بــە دڵخوشــی ئەمەویــست بــۆ ئــیش و کــار لــە ماڵــەوە دەربچــم ، ژنەکــەم هاتــە بــەر هێوانەکــە ڕاوەســتا و منــیش هــەر وەک ڕۆژان ئاموژگــاری ئــیش و کــاری ڕۆژانــەم کــرد و بــۆ کرینــی کەلوپــەلی پێویــستی ڕۆژانــە پــارەم بــۆ بــەجی هیــشت، لــە بــەر ئەمــە ئیمــە منالمــان نــەبو زۆر بــەی کارەکــانی پێویــستی ماڵــەوە ژنەکــەم خــۆی ئــەنجامی ئــەدا، نــەبونی منــاڵیش تــاوانی مــن بــو نــەکو ژنەکــە بــەڵی ئــەو ڕۆژە بــۆ هــەوەڵین جــار لــە پــاش شــەش مانــگ چــاوم پێکــەوت هاجــەر چاوەکــانی لــە چــاوی مــن بڕیــوە و زەردە خانەیــەکی لەســەر لیوەکــانی نیــشتو وە بــەدمی پێکەنینــەوە هــەتا بــەرد درگاکــە لەگــەڵم هــات و منــی بــەڕی کــرد، زۆرم پــی خــۆش بــو منــیش بــە دم پێکەنینــەوە خــووا حــافیزیم لــی کــرد و ڕویــشتم، لەگــەڵ کــاک رەســولی هــاوڕێم بــۆ ئــیش کــردن کەوتینــە ڕی، بــە قــەزای خــووا ئــەو ڕۆژە کارەکــەمان هــەتا ئێــواریکی درەنــگ خایانــد، کــاتی لــە ئــیش تــەواو بــوین وگڕاینــەوە بــۆ لای مــاڵی خۆمــان زۆرم پــی ســەیر بــو کــە هاجــەر لــە بــەر درگاکــە ڕانەوەســتاوە و چــاوەڕوانی هاتنــەوەی مــن ناکــات، خورپەیــەک کەوتــە نــاو دڵــم، بــە زۆر درگاکــەم کــردەوە و چومــە نــاو حەوشــەکە هەمیــسان چــاوم بــە ژنەکــەم نەکــەوت بەســەر ســوڕمانەوە خــۆم بــە

ژوری دا کـــرد ... » مـــن نانەکـــەم تـــەواو کردبـــو چایەکـــەم دەخـــواردەوە و چـــاوم لـــە دمـــی کـــاک ســـابیر بڕیبـــو بـــۆ ســـەر ئـــەنجامی وتوویژەکـــەی، کـــاک ســـابیر ڕاوەســـتا و مـــات بـــو، ئـــەمجار چاوەکـــانی پڕبـــون لـــە فرمێـــسک و ڕەنگـــی گـــۆڕا و ســـەری داخـــست، فرمیـــسکەکانی بـــە چـــاوی دا هاتـــە خـــووار. مـــن کـــە تـــەواوی هـــۆش و بیـــرم کـــەوتبو ســـەر ئـــەم باســـە زۆر بـــە ئـــاواتی ئەمـــە بـــوم بـــزانم ئـــاخری ئـــەم باســـە بـــە کـــوی ئـــەگات. هـــەر وەک کـــامێرەی وینـــەگرتن چاوەکـــانم بڕیبـــو لـــە دمـــی کـــابرا ڕوانـــیم کـــاک ســـابیر ڕاوەســـتا و هـــیچ نالێـــت زۆر زۆرم پـــێ ســـەیر بـــو، پـــڕ بـــە دم هـــاوارم کـــرد و وتـــم : « کـــاک ســـابیر فـــەرمو بـــزانین لـــە پاشـــان چـــی بـــو؟» کـــابرا هـــیچ وڵـــامی پێنەدامـــەوە ناچـــار بـــوم قـــۆلیم گرتـــو ڕام وەشـــاند، کـــابرا ســـەری بـــەرز کـــردەوە و چاوەکـــانی لـــە مـــن بـــڕی و بـــەڵام بـــێ دەنـــگ بـــو، منـــیش هەمیـــسان پرســـیارەکەم دوپاتـــە کـــردەوە و وتـــم : « کاکـــە ... کاکـــە فـــەرەو لـــە پاشـــان چـــی بـــو؟ » کـــابرا هـــەر وەک لەســـەر ئـــەم دونیایـــە نـــەبێ وڵـــامی نـــەداوە و چاوەکـــانی زەق ڕاوەســـتایون بـــە بـــێ دەنگـــی ئـــەگریا. ناچـــار بـــوم ســـەرم بـــەردە پێـــشەوە و لـــە بـــن گـــویی پرســـیارەکەم لێکـــردەوە . کـــاک ســـابیر وتـــی : « ئـــەمجار هـــەر وەک لـــە کـــاتی خـــۆم بـــەزورەوە داکـــرد چـــاوم پێکـــەوت ژنەکـــەم ژنـــە خۆشەویـــستەکەم بـــێ نـــاز لەســـەر ئـــەرزی کـــەوتووە و

چاوەکـــانی دەرپـــەڕی بـــون و بـــاریکی خـــونیکی ئـــاڵ بـــەلا دمـــی دا هاتۆتـــە خـــوواری و ڕوحـــی پـــاک و خـــاوینی لـــە لەشـــی جیـــا بۆتـــەوە و ئەنـــدامی وەک ســـەهۆل ســـارد ببـــۆوە» کـــابرا ئەمـــەی وت وە لـــە بـــەر هیرشـــی ســـیڵاوی فرمیـــسکی چاوەکـــانی چـــی کـــەی پـــێ نـــەوترا و بـــی دەنـــگ بـــو، بەئاســـپایی کەلوپـــەلیکانی کـــۆکردەوە و خـــووا حـــافیزی کـــرد و لـــیم جیـــابۆوە ... چـــاوم تـــێ بـــڕی هـــەتا لـــە چایخانەکـــە دەرکـــەوت، ئـــەمجار مـــن مامـــەوە و کۆڵـــە باریـــک خـــەم و خەفـــەت وە دڵ ئـــاڵۆزی. گـــویم لیبـــو کـــە شـــاگردی ئوتومبیلەکـــە هـــاواری لـــە ئیمـــە دەکـــرد ئـــەیوت تکایـــە ســـووار بـــن و کـــەس بـــە جـــی نـــەمینی ئـــەوە ئـــەڕوین کاکـــە وەرن ســـووار بـــن ئـــەڕۆین . پـــەیتا ... پـــەیتا شـــوفیرەکە بـــۆقی لـــی ئـــەدا و چـــاوەڕوانی ئـــەو کەســـانە بـــو کـــە هێـــشتا ســـووار نـــەببون، هـــەمویان ســـووار بـــون بـــەڵام مـــن خـــۆم کـــەر کـــرد و خـــۆم مـــات کـــرد، لـــە پـــشت میزەکـــە خـــۆم مـــات دا، لـــە نـــاو دڵـــی خـــۆم داوا بەباشـــی زانـــی لـــەم سەفەرە نەکەم و بۆ لای ماڵ و مناڵەکانم بگەڕیمەوە... .

سەرماوەزی ساڵی ١٣٧٠ هەتاوی

بەشی
پینجوم

پیر خدر



لە سەر کێویکی بەرز و پڕ لە چڕو بەرد، داریکی ئەستور کە لەق و پۆپێ لە هەر لاوە بەڕادەی تەمەنی بڵاو کردۆتەوە. لە بەر چاو دیارە و لە دورەوە بتەواوی زۆر باش دەبیندری، بەتایبەت لە مانگی خاکەلیوەدا، کە هەمو گیا و گوڵ و پەلەوەر و گیان لەبەرەکان لە دەستی سەرمای دڵ تەزێن و نالەباری زستان ڕزگار دەبیو وە بە تێکڕایی دەبوژینەوە . دەشت و چیاکان بەرگی سەوز دەپۆشن بەرادەیەک جووان دەبن هەر وەکو کیژیکی تازە لاو و پێکەیشتو کە دڵ لە ئادمیزاد دەفڕینی، ئەم دارەش لەم مانگەدا بەباشی خۆیی دەنوینی، لە بەر ئەمە ئەم کێوە گەورەیە لە ناوچەی کوردوستانە وە لە نیوانی سی چوار گوند بەدی هاتووە. ئەم دارە دیمەنیکی جووان پێشان دەدا، بۆ ئەم کەسانەی کە لەم ڕێگایانە هاموشو دەکەن، زۆر لە خەڵکی شار و گوندەکان ئاواتە خووازن کە ڕۆژیک لە ڕۆژان بێ ئیش و کار بن لە کێوەکە سەرکەون و لە پێشەوە سەری ئەم دارە بکەن، کێوەکە زۆر بەرز و چڕ و بەر دە، زۆر تەق تەقە شوینی هاموشو

کردنــی ئوتــومبیلی نییــه، جــا هــەر کەســی هەوەســی زیــارەتی هەیــە ئەبێ بــە پێیــان ســەر کێــوە کــە کــەوی، هــەمو ســاڵی لــە پــاش تــەواوبونی سەرما و ســوڵ زســتان و بــاران بــەڕینی بــەهاری، بــە تایبــەت لــە ســی مــانگی هــاوین دا، ڕۆژانــــی چوارشــــەمە خــــەڵکیکی زۆر بــــۆ زیــــارت دەچنــە ســـەر ئــەو شەخــسە، مــن و دو هاوڵــەکانم یــانی ( هــەباس و مامەنــد) زۆر ئاواتــەخووا بــوین کــە ڕۆژیــک حۆمــان ئامــادە کــەین و پەیکــەوە بــەچین بــۆ ســەر ئــەوکێوە و لــە نیزیکــەوە چاومــان بــەم دارە بــەرز و شەخــسەکە بکــەویت ... لــە پــاش ماوەیــەک ڕۆژیــک مــن و دو هاوڵــــەکانم بڕیارمــــان دانــــا. کــــەڕۆژی چوارشــــەمەی حــــەوتوی داهاتوکەلوپــــەلی پێویــــستی ئامادەکــــەین وبــــڕوین بۆئــــەم ســـەفەرەجاهەر ئمـــە بـــۆڕۆژی سەشەمەپیویـــستی کـــان مـــان ئامـــادەکرد وپیمانمــــان دانــــا بــــەیانی زۆرزولەخەوهەســــتین وبــــە تیکڕایــــی ڕێ کــەوین مــن وتــم دوســتان ئــەگر قــەبول بکــەن مــن واپ پــیٚ باشــەکەئەم شــەو ئێــوە بــین بــۆ مــاڵی ئیمــە میــوانی ئیمــەبن هەرلــەوی شــیو دەخۆینــو لــەویش دەخــەوین و بیــانی زولــە خــەو هەڵدەســتین وڕیــی دەکــــەوین . هــــەردوکیان پێــــشنیارەکەی مــــەنیان قــــەبوڵ کــــرد . بــەکورتی ئەوشــەوە لــەمالی ئیمەمانــەوەو لــەپاش شــێو خــواردن و چــایی هێنــدی لــە بابــەتی ســەفەری بــەیانی باســمان کــردو لەپاشــان

خـەوتین . کـاتی چـۆارو نیـوی نیـوه شـەوبو کەهـەباس خەبـەری بـۆوه و بـانگی لـە ئیمـە کـردو ئیمـە شـی لەخـەو هەسـتاندو بەپەلـە دەموچاومـان شوشـت و بـەگورجی کەلوپەلـەکانمان بـەکۆڵ داداو مـەلی ڕێگامـان گـرت و بـە هۆمیـدی خـووا دەسـتمان کـرد بەڕۆیـشتن . ئیمـە پەلـەی ئـەوەمان بولـەپێش خۆرکـەوتن بتـوانین وەسـەر کێوەکـە کـەوین . لـەبر ئمـە مـانگی گـەلاویژ بـو وەلـەم مانگـەدا ناوچەکـەی ئیمـە وەک تـەنور گـەرم دادیـت سـور دەبێتـەوه . هـەر چەنـد سـەمانگی بـەهار و سـەمانگی هـاوین تـەوۆاوی دەشـت و چیـاو باخـەکان پـڕ لەسـەوزایی و گـولْ و گـەیای نـەرموجووان نـەن بـەکورتی لەناوگولْـدا خـەملْیوه . بـەلاْم وەرزی هـاوینی زۆر گەرمـەوه زسـتانی شـی زۆر سـاردە جالـەبر ئمەهەرکەسـی هەوەسـی زیـارەتی پیرخـدر دەکـا. ئـەبیْ بیـانی زۆر زو لەخـەو هەسـیتی و بکەویتـەڕی هـەرجۆریک بـیْ ئـەبی خـۆیی بگەینیتـە سـەر کیـوه کـە لەبرئمەئەگرخۆرهـەلاْت گرمادەسـت پێـدەکات و زۆر کـەس تاقـەت نـاهێنی بـەتۆانی وەسـەرکێوەکە کـەویت بۆیـە ئیمـە بـەیانی زۆر زو کەوتینـەڕی وهیـۆاش هیـۆاش بـەوتوویژو گالْتـەو گـەپ بـەرو ژۆر ڕویـشتین . هـەباس وتـی کوڕەکـان لام ۆایـە ئیمـە هـەولْین کەسـانیک دەبـین کەدەگینـە سـەر کێوەکـە لەبرئمـە لـە دەوروبرمـان کـەس

دیارنیە مامند وتی شەومان لینەگۆڕابی کات ئەژمیرەکەدەرۆیی لەگەڵمان کردەبی. شنەشەنی بای بیانی بەئارامی لەسەرو مەلو دەموچاومانی دەدا. کەیفەمان زۆرخۆش بو وردەوردە هەتانیوەی کێوەکە سەرکەوتین لەپڕدامامەندروی کردە ئیمەو هاواری کرد، کۆرەکان ... کۆرەکان سەرهەڵ بێنن باش بڕوانن نزیک لوتکەی کێوەکە چەندتارمای دیارن . ئەبێ ئەوانەکی بن؟ کاتی ئیمەش سەرمان هەڵینا بەجووانی سەرنجمان دایەوە لیی خوردبوینەوە. هەباس هاواری کردو وتی ئەمانەئادەمیزادن .ئەیی ئەوەچۆن کەوتونەتە پیش ئیمە من وتم براکەم ئیمەخۆمان زۆرپی زیرەکەبەلام لە ئیمە زیرک تەریش هەیە بە کورتی شەقاوەکانمان توندکردو بەپەلە دەستمان کرد بەرۆیشتن لەوانەبو هەناسەمان لی ببڕی . هەرجۆریک بو خۆمان گەیاندەسەر کێوەکە کاتی گەیشتینەسەری چاومان پێکەوت سەچوارماڵی کەکەلوپەلەکانیان بەلاو کردۆتەوەو خریکی ئامادەکردنی چایی و حەسانەوەن . من و هەباس و مامەندیش لەلایەکەو دانیشتین و کەلوپەلاکانمان لەکوڵمان داگرت و لەسەرگەیایی سەوزونەرم ڕاکەشاین بەلام لەبرماندوو هیلاکی هیچ کام مان مرتەقمان لینەدەهات ماوەیەک پیچو تازە چاوەکانم گەرم ببون. کەهەباس

بانگی لیکردم ووتی هەستە... هەستە حەیامان چوە من لەپڕداڕاست بومەوە دەوروبەری خۆم ڕوانی چاوم بە خەڵکیکی زۆر کەوت کەبەپانی هەرچواردەوری دارەکە ڕاخەریان ڕاخستبوو دانیشتبون . ئیمەش بەگورجی کەلوپەلەکانمان بلاوکردەوەو ڕاخەریمان پیٚ بوڕامان خەست و دانیشتین وەمامەند خریکی ئامادەکردنی نان و چایی بو لەپاش حەسانەوەیەکی باش چایەکەمان پیٚ گەیشت و دەستمان کرد بە نان خواردن . کاتی لەنان و چایی تەواو بوین ولات بەتەواوی گەرم ببو خەڵکی لەهاموشودابون و هەواڵی یەکتریان ئەپرسی منالانیش بەیکەوە گالتەو گەپیان دەکرد . من وردەوردە خەزیم خۆم ڕاکیشابۆ ژیر دارەکە هەستامە سەرپیٚ وسەرم هەڵبڕی و چاوم بەدارەکەدا گیٚڕا بەڕاستی زۆر بەرز بووە بنجی زۆر ئەستور بو. ئەندامی وای پیشان ئەدا کە ئەم دارە زۆر کۆنەلەهەرە پیرە دارەکۆنەکان لەلای ژیرەوەی لەق و پۆپی دارەکەتا ئەو جیگایەی دەستی پیٚ دەگا پەڕۆیی سەوزی ورد وردیان لی گری دابوو دەرزیلەیان پیوە هەلاوەسی بو.

لە دوره وە دیمەنیکی زۆرجوانی هەبو،من خەریکی سەیر کردنی دارەکەبوم . هەباس و مامندیش هاتن بۆلام دەستمان کرد

بە وتوویژ من زۆرم پێ سەیربو لە سەر ئەم کێوە بەرزە ئەم دارەپیرە و ئەستور و زلە بەچی دەژی، وەلەکوی ئاودەخواتەوەمات ببوم کەهەباس شانی گرتم وتی تۆبڕوانەکاری خوا ئەم جۆگەئاوەباریکەت دیوە . کەس نازانی ئەم ئاوە لەکوی دیت و سەرچاوەکە لە کەوی یە بەلام بەقودرەتی خوا جوگەکە ڕاست بەبن ڕیشەی ئەم دارەدا دیت و هەم دارەکە و هەم خەلکی کە بۆ زیارت بۆ ئیرە دین ئاوی لی دەخۆنەوە من زۆرم سەرنج دا بەو جیگایەکە ئەم ئاوە بە قودرەتی خوا لەسەر ئەم کیوە بەرزە هەل دەقولی و ... کاتی ئاوڕم داوە چاوم پیکەوت کە هەباس و مامەند کەمیک لەمن دورتر ڕاوەستاون وەلەگەل ژنیکی پیری سەر سپی بە ڕواڵەت تیگەیشتو کە تەمەنی نیزیک بەحەفتا سال دەبو وتوویژ دەکەن منیش خوم بولایان ڕاکیشاو ڕویشتم تیکەل ئەوان بوم گویم بۆ وتوویژەکەیان ڕاگرت . ژنەکەوتی بەلی ڕۆلەکانم لەژیر ئەم دارەدا تەرمی پیاویکی سەیدی نورانی و پیاو چاکی لی نیژراوە کظ یەکی لە پیاو چاکانی خوایە . هەروەک بۆ منیان باس کردووە یانی باوە پیرەم بۆ باوکەمی باس کردووە. وە ئەویش بۆ مەنی دەگیراوە ئەم شەخسە یەکی لە بنەماڵەکانی گەورەو سەیدی ساداتی عیراق بووە. لەعیراقەوە بۆ لەبین بردن و

جیهـاد لـه ڕاهـی خـوا هـەروەک میژو باسـی دەکـات و بـاوکم بـۆی گیڕامـەوە هـاتووە بـۆ ئیـران هـەتا لەگـەڵ عروسـەکان کەچەنـد سـاڵ لەمـەو بـر هـاتبون بـۆ ئیـران بۆتـالان کردنـو و پیاوکوشـتن ولاواز کردنـی دینـی ئیسلام هیرشـیان هێنـابو. ئـەم پیـاوە بـاش و موسـڵمان و بـە دینـەش لەگـەڵ زۆر کـەس لـەپیاوە باشـەکان و ژنـە بەشـرەفەکانی عیـراق و ئیـران وەک پاڵـەوان ڕاوەسـتان و هـەتا تـەنۆکی ئـاخری خـوینی ئـال و گەشـیان بربرەکانیـان کـردو دوژمـەنی مـەل هـۆڕو ڕو ڕەشـیان بەزۆرلـە تـەواوی ناوچـەکانی کوردسـتان و ئیرانـی خۆشەویـست ڕادا . وەئـەم پیـاوە باشـو بـەدین و ئیمانـە کەلـە سـەردینی خـوا شـەڕی دەکـرد لـەم جیگایـە شـەهید بـووە لظنـاو خـوینی ئـالی خویـدا گیـانی پـاکی دەرچـو . پیاوەموسـڵمانەکانی ئەووختـە هـەر لێـرە ناشـتیان و تەسـلیم بـەخاکیان کـرد . ئـەم دارەش کەئیـستا ئیـوە ئـەی بیـنن نـەمامێک بـووە کەلەسـەر قـسنەکە بـو نیـشانە چەقاندویانـە . بـەڵام بـە تێپڕبـونی ئـەو ماوەیـە ئیستا بۆتـە ئـەم دارەگـەورەو ئەسـتورە کەمرقەدەکـەی خـستۆتە ژێـر خـۆی و داپۆشـیوە . هـەرۆەک بۆیـان گێراومـەوە وە لـەزۆر کەسـانم بیـستووە نیزیـک بـە حـەفتا سـاڵ لەمـەو بـر لـەم گونـدەی ژیـرەوە. ژنیـک دەژی بـەناوی بـوک فاتـەم مـاوەی چەنـد سـاڵ دەبـی شـودەکات بـەلام

هـــەرچی دەکـــا منـــاڵی نابێـــت . بـــوک فاتـــەم زۆر دڵ بخـــەم و ناهومێـــد دەبـــی . شـــەویک لەشـــەوان کـــەبوک فـــاتم هـــەروەک شـــەوانی رابـــردو بـــەچاوی پـــڕ لـــە فرمیـــسکەوە دەخـــەوی . لـــە خـــەودا پیـــاویکی جـــەماڵ پـــاکی نـــورانی دێتـــە خـــەوی و بـــەبوک فـــاتم دەڵـــی ڕۆژی چوارشـــەمو بـــەیانی زۆر زو لەخـــەو هەســـتەو بـــە دەســـتی بـــە دەســـت نـــویژو جـــەل و برگـــی خـــاوین هەســـتە بـــڕۆ بـــۆ ســـەر ئـــەم کێـــوە زیـــارەتی ئـــەو شەخـــسە بکـــەو دورە کائـــەت نـــویژی بـــەیانی بظجـــی بـــظ هێنـــە وە داوا لـــە خـــوا بکـــە هـــەر نیازیکـــەت هـــەبی بـــوت بـــەدی دیـــت . بـــوک فـــاتم لەخەوەکـــە ڕادەپـــەڕی ، بـــە وتـــەی ئـــەو کەســـانەی لـــەو عەســـروکاتە دابونـــو دراوســـیی بـــوک فـــاتم بـــون ئـــەوان وایـــان بـــۆ خـــەڵکی گێـــراوە تـــەوە. دەم بـــە دەم بـــاس کـــراوە تـــا کـــو ئیمـــڕو بـــوک فـــاتم ئـــەوەیی لـــە خەوەکـــەدا پـــی دەوتـــری بـــەم جـــۆرە ئـــیش و کارەکـــان ئـــەنجام دەداو ئەڕواتـــە ســـەر قـــسنەکەیانی دیـــت بـــۆ ئیـــرە نیـــازی دڵـــی بیـــان دەکـــاو لـــەخوا ئەپارێتـــەوە بـــەڕەزای خـــووای گـــەورە و میهربـــان لـــەپاش نـــۆ مانـــگ و چەنـــد ڕوژ منـــالێیکی جـــوان و کۆرپـــەی دەبێـــت کۆزەکـــەی نـــاو دەنـــین ئەحمـــەد لـــەپاش ئەحمـــەد خـــوا چەنـــد کـــوڕو کـــەچی کەشـــی پێـــدەدات . ئـــەم جـــار زۆر لـــە ژنـــان و پیـــاوان ســـەچوار شـــەمو دینـــە زیـــارەتی ئـــەم شەخـــسەو نیازیـــان قـــەبوڵ دەبـــی . ئـــەم ژنـــە پیـــرە کـــە نـــاوی خـــات نـــازدار بـــو

بەرادیـــەک جووّانـــو ڕازاوە ئـــەم مبەســـتانەی بـــۆ ئیمـــە بـــاس دەکـــردو ئیمـــەی حـــاڵی دەکـــرد هـــەروەک ماموســـتایەکی بـــاش کەلـــە قوتابخانـــە دەرس ئـــەدا ئیمـــەی حـــاڵی دەکـــردو ڕونـــی دەکرینـــەوە. لـــە پاشـــان بـــەم جـــۆرە دریـــژەی بەوتـــەکانی دا وتـــی لـــەو دەمـــەوە هـــەتا کـــو ئێـــستا تـــەواوی ڕۆژی چوارشـــەمو بـــە تایبـــەتی لـــە ئـــاخر مـــانگی بـــەهارو ســـە مانگـــەی هـــاوین هـــەروک دەبیـــنن ئـــاوا پـــڕ لـــە خەڵکـــە. زۆر تریـــان لـــە گونـــدە دورو نیزیکـــەکان و لـــە شـــارەکان بـــۆ زیـــارەت دێـــن ئـــەو کەســـانەی کـــەوا ڕێگایـــان دورە یـــەک دو شـــەو هـــەرلێرە دەمێنـــەوە و لێـــرەش دەخـــۆن و دەخـــەون. لـــە پـــاش ڕۆیـــشتنەوە خیـــر و خیراتیکـــی زۆر بـــۆ پیـــر خـــدر دەکـــەن بـــۆ ئـــەوە نیازەکـــەیان قـــەبوڵ بێـــت . ئیمـــە گـــویی مـــان بـــۆ شـــەل کردبـــو . بـــۆ ئـــەم باســـەی کـــە کـــە پـــورە نـــازدار بـــۆ ئیمـــەی لـــە بابـــەت ئـــەم پیاوچاکـــە بـــۆی بـــاس دەکـــردین . هۆشـــمان هەرلـــە پـــوری بـــووە چاومـــان لـــەدمی بـــو . لـــەپڕدا چاومـــان بەهـــەڵپڕکی کـــەوت تۆزیـــک لەئیمـــە دوربـــون ڕەش بەڵـــەک تیکـــەڵ ببـــو ژن وپیـــاویکی زۆر دەســـتیان گرتبـــو وەهـــا هەڵدەپـــەڕێن وەرەســـەیریان. خـــات نـــازدار وتـــی ئەوانـــە ئـــەیانبینن وابـــە شـــادی و خۆشـــی هەڵدەپـــەرن لـــە برئمـــە یەکـــە نیازیـــان قـــەبوڵ بـــووە ئیـــستاش لـــە خۆشـــیان بـــەم جـــۆرە شـــادی دەکـــەن مـــن وەهـــا چـــو بـــو مـــە نـــاو بیـــرو

فیکریکی قوڵەوە کە هۆشم لیبڕابو لەناو دڵی خۆم دا وتم خوای هەرچی تۆنەی دەی نابی و هەرچی تۆ ڕەزات لە سەر نەبیٚ نابیٚ... من وەها لەخۆم جیا ببومەوە نەم زانی کە پورە نازدار کی خوواحافیزی کردۆ رۆیشت . مامەند قۆڵی گرتم بابڕوین ئیمەش ویڕای ئەم خەڵکە هەڵپەرین وە شادی بکەین هەباس بە پیٚکەنینەوە وتی: « خۆ برام هیٚستا نیازی ئیمە قەبول نەبووە هەر سیٚکمان بە یەکەوە دەستمان کرد بە پیٚکەنین، بۆ لای هەڵیرپینە کە ڕۆیشتن، چوینە ناو داوەتەکەوە هەتا هیلاک و ماندو بوین تیرهەڵپەرین، نیزیک نیوەڕۆ بو کە وردەوردە هەڵپەرین تەواو بو لە پڕدا کابرایەک هاواری کرد و وتی:«خۆشک و براکان هەموتان بۆ خۆاردەنی نانی نیوەڕۆ میوانی منن لە بەر ئەوە نیازەکەم قەبولی درگایی خووا بووە، مەڕیکی گەورەم هیٚناوە و بیانی سەریم بڕیوە و ژنەکان لە بیانیەوە خەریکی چیٚشت و نانن، لام وایە تاکو ئیٚستا ئامادەی خۆاردن بیٚ» هەمو بە تیٚکڕایی قەبوڵمان کرد و لە پاشان ویڕای کابرا ڕۆیشتینە ئەم شوینەی کە کابرا دیاری کرد بو، ڕیزمان گرتو دانیشتین، لە پاش ماوەیەکی کەم کابرا و کوڕەکانی سفرەیان ڕاخست و نان و چیشتیکی زۆریان هیٚنا و دەستمان کرد بە خۆاردن، مامەند و هەباس ئەوندەیان

برسـی بـو تێرنـەدەبون، مـاڵی کـابرا ئاوابێـت لـە پـاش نـان خـواردن چـایی مـان خـواردەوە و میوانـەکان نیزیـک بـە سـێ کـەس دەبـون، لـە پاشـان خـوا حـافیزی و مـاڵ ئاواییمـان لـە کـابرا و کوڕەکـانی کـرد و بـۆ حەسـانەوە چوینـە جێگاکـەی خۆمـان و ڕاکـشاین، مـن زۆر هـیلاک بـوم کـاتی ڕاکـشام هۆشـم لیبـڕا، بـەڵام مامەنـد هـەباس لـە بـر خۆیانـەوە بـە نـەرمی وتوویژیـان دەکـرد، نـەم زانـی باسـی چـی دەکەن، خۆم لی کەوت ....

لـە پـاش ماوەیـەکی زۆر بـە هـاوار و قیـژە قیـژی تاقـەمێک منـاڵ خەبـەرم بـۆوە، کـاتی چـاوەم کـردەوە مامەنـد لـە لام دانیـشتبو، بـەڵام هـەباس دیـار نـەبو، زۆرم پـێ سـەیر بـو ڕوم کـردە مامەنـد و وتـم : « هـەباس کـۆوا؟ چـی بەسـەر هـاتووە؟ » مامەنـد وڵـامی دامـەوە وتـی : « وەرە بـە ئاسـپایی بـڕۆین بـۆ لای هـەباس» مـن کەوتمـە شـەک وتـم : « چـی بـووە بـۆچ ڕاسـتم پـێ ناڵیـت» مامەنـد وتـی : « بـە خـوا هـیچ بـەڵام وەرە هەباسـت پێـشان بـەدەم» مامەنـد کەوتـە ڕیـە لـە پێـشەوە و منـیش کەوتمـە شـوینی. کـاتی دەورەی دارەکـەمان دا چـاوم پێکـەوت هـەباس هـەر وەک منـاڵیکی هـەتیووە و بـێ کـەس هـەر دوک دەسـتەکانی لـە ژێـر دارەکـە بـەرو ئاسـمان بـەرز کردۆتـەوە و دەسـتی کـردووە بـە دوعـا و پاڕانـەوە، بـەپانی دەم و چـاوی

فرمیسکی گەرم لە چاوەکانی دێتە خوار، من زۆرم پێ سەیر بو ویستم بەچم شانی بگرم ... بەڵام مامەند قۆڵی گرتم و بە هێواشی وتی: «تو خووا مەحموود تۆ گیانی من باسی مەکە و وا باشە خۆمانی پێشان نەدەین» تۆزێک کشاینەوە دوواوە من وتم:«مامەند ... مامەند ... هەباس چی لیقەوماوە بۆچ دەبێ من نەزانم» مامەند وتی: «منیش وەک تۆ مەحموود» وتم: «بە خووا تۆ ئەزانی بەڵام لە منی حەشار دەدەیی ئەگەر بێتو پیم نەڵیت ئەبێتە خەفەت لەسەر دڵم» مامەند وتی: «لەوە دەترسم هەباس بەم مەبەستە بزانێتو وە لە من زیور بیت چونکە من بەڵینیم پێ داوە لە لای کەس باسی نەکەم» من وتم: «لە من دڵ نیگەران مەبە، لەدمم دەر ناچێت» مامەند وتی: «بە خووا مەحموود هەباس دەمیکە ئەوینی زارای کچی حاجی حەسن بووە و وەک هەباس بۆمی گێراوە زاراش هەباسی زۆر خۆش ئەوی، بەڵام لە بەر ئەمە کە هەباسی دەست کورتە و فەقیرە حاجی زارای پێ نادا، هەر لەبەر ئەوەشە هەباس ماوەیەکە وا دڵگیر و ماتە ... » من وتم: «لەبەر چی تاکو ئێستا من نەم زانیوە، مەگەر من دۆست و هاواڵی هەباس نیم» مامەند وتی: «مەحموود تۆ ئەوندەت ئیش و کار هەیە خۆ حەوتوی جاریک چاومان بەیەک ناکەوی » وڵامم

داوه و وتم : « بە خوۆا مامەند تۆ ڕاست ئەکەی من ئەوندە توشی تەنگە و چەڵەمەی ژیان بوم دوست و هاوڵەکانم بتەواوی لە بیر چو بۆوه ... » کاتی سەرمان هەڵینا من چاوم بە هەباس کەوت و وردەوردە ئەهات بۆ لای ئیمە مامەند وتی : « تکا دەکەم مەحموود باسی دەم مەبەستە نەکەی من بەڵینیم پێ دا کەس لیم نابیستی» هەباس گەیشتە لای ئیمە و وتی : « خۆ من دەمیکە لە شوین ئێو دەگەڕیم» وتم تۆ دیار نەبوی ئیمەش هاتینە ئیرە تەماشای هەڵپەڕین دەکەین هەباس وتی:«ئەوندەی بۆ ڕۆژ ئاوا نەماوه وەرن گەڕیک هەڵپەڕین با خۆشی ئیمرۆمان تەسل بێ لە پاشان تەواوی کەل و پەلەکانمان کۆ کەینەوه و بەرو ماڵ بکەوینەڕی. مامەند وتی : « زۆر باشە » من وتم : « لە من ببورن ئەوندە هیلاکم ناتوانم هەڵپەڕم» ئەوان بە جوت ڕۆیشتن تێکەڵ داوەتەکە بون. من کە تەنیا مامەوه بیرم لە قودرەت و گەوریی خوۆا دەکردەوه، لە بون و نەبون لە دڵداری زارا و هەباس، لە باوکی زارا حاجی خەسن بە کورتی لە زۆر شت، ڕاوەستا بوم چاوم لە داوەتەکە دەکرد و لە هەباس و مامەند کە بە شادی خۆیان هەڵ داویشت، مامەند دەستی لە ناو دەستی کیژیکی زۆر جووان و باڵا بەرز و قژ ڕەش دا هەڵدە پەری، لەگەڵ کیژەکە جار

جار بە یکەوە ڕۆیان تیک دەکرد و لە ژێرەوە ورتە ورتیان دەهات، کەس نەی ئەزانی ئە دووانە دەڵین چی بە ئاسپایی لە داوە تەک دورکەوتمە و ڕۆیشتم بۆ لای جێگاکەی خۆمان کاتی ڕۆانیمە کات ژمیرەکەم ئەوندەی بۆ ڕۆژ ئاوا نەمابو دەستم کرد بە کۆ کردنەوەی کەلوپەلەکان هەمویانم کۆکردەوە و ئامادەم کرد، ڕۆیشتم لە بن دارەکە ڕاوەستام سەیری خەڵکەکەم دەکرد. ڕۆم کردە ئاسمان و وتم : « خووایە هەر ئەتۆی ئینسان بەرز دەکەیی و قەدر و حورمەتی پێدەدەیی و هەر تۆشی ناتەوان و زەلیلی دەکەی خووا یا ئەگەر تۆ مەیل و ویرادەت لە سەر هەر کاریک بێ بەئەنجام دەگات و هیچ کۆسب و هۆیەک ناتوانی پێشی بگریت ...» ڕۆیشتمە سەر ئاوەکە و دەست نویژم شوت و دەستم کرد بە نویژ کردن چوار ڕەکاعەتی نویژ ئێوارە بەجی هێناو وتم : « خووایە من نیازی خۆم تەنیا هەر لە تۆ ئەویت» دانیشتم تۆزیک بحەسیمەوە، داوەتەکە تەواو بو، خەڵکی بلاوەیان کرد و لەو کاتەدا هەباس و مامەند بە هەناسە برکی گرانەوە بۆلام، هەباس کەوتە بو پێشەوە و مامەندیش بە شوینی دا، هەباس وتی : « مەحموود ... مەحموود مزگێنیم دەیە مزگێنی » وتم : « چییە چی بووە، وەرە لام دانیشە هەتا بزانم مزگێنی چی » مامەند: « وتی

کـوره هـەباس جـاری ڕاوەسـتە بـاس مەکـە» هـەباس وڵـامی دایـە و وتـی : « بـە خـووا زگـم ئـەنباری کـەس نییـە » مـن سـەرم سـور مـابووە و دووپاتـەم کـردەوە وتـم:«چـی بـووە چـی قـەوماوە؟ بـۆ چـی دەمـو گـەریی داوە و هـیچم پـێ نـاڵین؟ » هـەباس بـە پێکەنینـەوە وتـی : « مـەحموود لـە سـایەی خـووا مامەنـدیش نیـازی دڵـی قـەبوڵ بـو» مـن هەسـتامە سـەر چـۆک و وتـم:«هـەباس گیـان نیـازی چـی؟ تێـوە مـن شـێت دەکـەن بڵـی بـزانم چـی بـووە؟ » هـەباس وتـی : « کـاتی ئیمـە هەڵدەپـەڕین خـۆ تـۆ چـاوت لـی بـو کـە مانەنـد لەدەسـتی لیژیکـی جـووان و باڵـا بـەرز هەڵدەپـەڕی» وتـم : « بـەڵی چـاوم لـی بـو» هـەباس ئەونـدە خۆشـحاڵ بـێ نـەی ئـەزانی چـی بڵێـت، پەشـوی هاتـەوە سـەر خـۆ و وتـی : ـــ لـە سـایەی خـووا جـۆر بـو مامەنـد و کیژەکـە ئـەوین یـەک بـون ویـەکتریان بـە دڵـە بڕیاریـان دانـا کـە ڕۆژی هـەینی حـەوتوی داهـاتو بـە تێکڕایـی بچـین بـۆ مـارەکردنی کـەژاڵ » مـن ڕەق ڕاوەسـتام و وتـم:«هـەینی چـی؟ کـەژاڵی چـی؟ » مامەنـد وتـی:«مـەحموود لـە بـەر ئـەوەی ڕێگاکـەمان دورە هـەتا شـەومان بەسـەر دا نـەهاتووە باشـتر ئەوەیـە کەلوپەلـەکانمان بـە کـۆڵ دا دەیـن و ڕیـی کـەوین، مـن لـە ڕێگـا بـە تـەواوی ڕۆداوەکـەت بـۆ دەگێڕمـەوە ...» مـن ئـەم پیـشنیارەم زۆر پـێ بـاش بـو، تـەواوی کەلوپـەلمان هـەڵ

گـــرت و ڕیمـــان داگـــرت لـــه ســـەر کێوەکـــه و ویـــستمان بـــەر و لیـــژ بکەوینـــه ڕێ، مامەنـــد ڕاوەســـتا و ڕوی کـــردە پیـــر خـــدر و هـــاواری کـــرد : « پیـــر خـــدر ئەگـــەر خـــوا کـــردی و نیازەکـــەم قـــەبوڵ بـــو دوجـــاری کـــەش دیـــم بـــۆ زیارەتـــت و خیـــر و خیراتیکـــی زۆرت بـــۆ ئەکـــەم» ئـــەمجار هـــەباس هـــاواری کـــرد و وتـــی : « پیرخـــدر منـــیش مـــەرج ئەکـــەم بـــه مـــەرجی پیـــاوان هـــەر وەک مامەنـــد، شـــەرتی خـــۆم بەرمـــه ســـەر ... » مـــن وتـــم : « زۆر درەنگـــه کوڕەکـــان بـــا ڕێ کـــەوین، هیـــوام ئەوەیـــه کـــه خـــوا نیازمـــان قـــەبوڵ بکـــات» وردەوردە شـــۆڕ بوینـــەوە بـــەر و خـــوار ئـــەمجار مامەنـــد بـــەم جـــۆرە ڕوداوەکـــەی بـــۆ گیڕامـــەوە وتـــی : « کـــاتی مـــن و هـــەباس لـــه تـــۆ جیـــا بوینـــەوە خۆمـــان هـــستە نـــاو کـــۆڕی هەڵپـــەڕکی کـــه بـــەخت یـــاری کـــردم چومـــه دەســـتی کیژیکـــی جـــوان و باڵـــا بـــەرز و ڕیـــک و پیـــک ، دو گـــەڕ لەگـــەڵ کیژەکـــه هەڵپـــەڕیم بـــه دڵـــم داهـــات ئـــەوەی مـــن دەمیکـــه بـــه شـــوینی دادەگـــەڕام خـــوا بـــه قـــسمەتی کـــردم و ئـــەوە لـــه دەســـتم دا هەڵدەپـــەڕی، لـــه پـــاش گـــەڕی ســـیهم هـــەر لـــه خـــۆڕا هەناســـەیەکی ســـاردم هەڵکیـــشا ئـــەو هەناســـەیە ئەونـــدە تونـــد بـــو کـــه کیژکـــه ڕوی تیکـــردم و وتـــی -چـــی بـــو تـــۆ خـــوا چـــەت لیقـــەوماوە ئـــەم هەناســـەیەت بـــۆچ وا بـــه تونـــدی هـــەڵ کیـــشا؟ - مـــن ســـور هەڵگـــەڕام و عارەقەیـــەکی گـــەرم بتـــەواوی لەشـــم دا هاتـــه

خـووا‌ر، لـه وڵـام دا وتـم ـ ببـوره هـیچ ... هـیچ نـه‌بو دوپاتـه‌ی کـرده‌وه و وتـی ـ بـۆچی ڕاسـتم پـێ نـاڵی تـۆش وه‌ک مـن بـۆ نیـاز هاتویتـه ئیـره‌؟ ـ مـن کـه تـازه هۆشـم هـاتبۆوه بـه‌ر خـۆم هیـوا‌ش هیـوا‌ش عاره‌قه‌کـه‌م سـارد ببـۆوه‌ی وتـم ـ چـی بڵـیم ، مـه‌حمود داواته‌کـه وه‌هـا گـه‌رم ببـو کـه‌س لـه کـه‌س ئاگـادار نـه‌بو، ئـه‌مجار کیژه‌کـه وتـی ـ ژن و مناڵه‌که‌شـت هێنـاوه ـ مـن بـه ئاسـپایی وتـم ـ تـا کـو ئێـستا خـووا‌ دایکـی مناڵـه‌کانی پـی نـه‌داوم، هـه‌تا بـو زیاره‌تیـان بـه‌هێنم ـ پرسـیاری کـرد ـ لـه بـه‌ر چـی هـه‌تا ئێـستا ژنـت هـه‌هێناوه ـ وڵـامم داوه ـ قـسمه‌ت نـه‌بووه بـزانم خـووا‌ گیـان چ قـسمه‌تی مـن ده‌کـا ـ ئـه‌مجار مـن پرسـیارم لیکـرد و وتـم ـ ئـه‌یی تـۆ چۆنـه هـاتوی بـو زیـاره‌تی پیرخـدر ـ وتـی ـ منـیش هـه‌ر وه‌ک تـۆ ـ لـیم پرسـی ـ شـوت کـردووه ـ وتـی نـه‌وڵ الله قـسمه‌ت نـه‌بووه ـ وتـم ـ نـاوت چییـه‌؟ ـ وتـی ـ نـاوم که‌ژالـه‌؟ ، پرسـیارم لیکـرد ـ مـاڵو لـه کوییـه‌؟ وتـی : « لـه گونـدی سـه‌رچاوه‌ین، زۆر لیـره دور نییـه بۆیـه ئیمـه هـه‌مو چوا‌رشـه‌مۆیان بـۆ زیـاره‌ت دینـه ئیـره ـ بزه‌یه‌کـه‌م هـاتی ڕوی تیکـردم و وتـی : « بـه چـی پـێ ده‌کـه‌نی » وتـم : « لـه خۆشـیان بـه خـووا‌ کـه‌ژاڵ خـوا‌یی گـه‌وره و میهره‌بـان و هیمـه‌تی پیرخـدر قـسمه‌تی مـن و تـۆی ڕیـک خـست، ئه‌گـه‌ر تـۆ بـۆ هاوسـه‌ری بـه مـن

ڕازی بیـت منـیش زۆر زۆر ڕازیـــم» ســەری داخـــست و لـــە پـــاش ماوەیـــەکی کـــورت ســـەری هـــەڵ هێنـــاو وتـــی : « قـــەڵم بینوســـی» مـــەحموود زۆر کـــەیف خـــۆش بـــوم وەهـــام پـــێ بـــە زەوی دادەدا نـــەم زانـــی شـــەوە یـــان ڕۆژ، لـــەم کـــاتی دا ژنیکـــی بۆشـــناخی نیـــۆان ســـاڵ و زۆر ڕیـک و پێـک کـە بـۆنی خۆشـی میخـەکی لـی ئـەهات هاتـە نیـۆانی مـــن و کـــەژاڵ دەســـتی ئیمـــە گـــرت و ویـــڕای ئیمـــە هەڵدەپـــەڕی ، مـــن بەم ئاکـارە یـەک جـار پـیم نـاخۆش بـو لەۆانـە بـو دەسـتم ئازادکـەم و لـە داوەتەکـە بـیم بـۆ دەرەوە، بـەڵام کـەژاڵ زو هاتـە فریـام و وتـی : « ئـەم خانمـــە دایکمـــە و نـــاوی خەجیجـــە، ئـــەمجار خۆشـــحاڵی ڕوی تیکـــردم و ســـڵاوم لیکـــرد و وتـــم دایـــە خـــەجیج نـــاوی مـــن مامەنـــدە، مامەنـــدی نـــوکرت، هیـــۆام ئەمەیـــە ئەگـــەر ئێـــوە قـــەبوڵ بکـــەن بـــەبم بـــە غوڵـــامی ئێـــوە چـــاویکی لیکـــردم ، مـــن زۆر زۆر تـــەریق بومـــەوە تـــەۆاوی لەشـــەم ســـارد بـــۆوە، دایکـــی ســـەری بـــردە بـــن گـــوویی کـــەژاڵ و دەســـتی کـــرد بـــە وتـــوویژ، منـــیش بیـــرم لـــە وتـــەی خـــۆم دەکـــردەوە لاقـــەکانم تێـــک دەهاڵـــان نـــەم ئـــەزانی چـــۆن هەڵدەپـــەڕم، دایـــە خـــەجیج ڕوی تیکـــردم و وتـــی: « کـــاک مامەنـــد پـــیم ۆابێـــت تـــۆ نـــازانی هەڵپـــەڕی » وڵـــامم داوە و وتـــم : « بـــە خـــوۆا ئـــەزانم هەڵپـــەڕم بـــەڵام لـــە شـــەرمی ئـــەو بـــێ ئـــەدەبی لـــە خزمـــەت تـــۆ دا کـــردم زۆر تـــەریق بومـــەوە بۆیـــە لاقـــەکانم تێکـــەڵ

دەبن، دایە خەجیج وتی : « ڕۆڵە هیچ زویر مەبە تۆ کوڕی ئیمەی منیش لەم بابتەوە زۆر خۆشحاڵم ئەگەر کەژاڵ ڕازی بێت منیش بەم پێگەیشتنە زۆر شاد و ڕازیم خووا موبارەکی کات، مەحموود کاتی ئەوەم لە دمی بیست بەڕادەیەک خۆشحاڵ بوم لە وانەبو باڵ دەرهەهینم و هەڵ فرم. دایە خەجیج وتی : « ڕۆڵە هەر خووا ئەزانی قسمەت و نەسیب چۆنە منیش هەر وەک ئێوە لە سەر قسنی ئەو پیرخدرە لەگەڵ پیروت، باوکی کەژاڵ، بنەڕەتی ژیانمان دا ڕشت و پاش ماوەیەک زەماوندمان کرد»، من وتم : « دایە خانم ئێستا کەتۆش ڕازیت من چی بکەم؟ » وڵامی دامەوە و وتی : « ڕۆژی هەینی حەوتوی داهاتو ویڕای چەند کەسیک لە بنەماڵەی خۆتان تەشریف بێنن بۆ ماڵی ئیمە لە گوندی سەرچاوە تاکو ئەودەم منیش لەگەڵ باوک و براکانی کەژاڵ وتوویژ دەکەم بە یاری خووا جۆر دەبێت، گەڕی ئاخری هەڵپەڕینەکە بو دەستمان بر دا و کەلەیەک جیا بینەوە، دایە خەجیج وتی :« ڕۆڵە مامەند ڕۆژی هەینی بۆ میوانی نانی نیوەڕو چاوەڕوانم » وتم : « بە سەر چاو دایە گیان ... » مامەند وتی : « تیگەیشتی مەحموود: وتم : « بەلی ... بەلی زۆر باش تیگەیشتم لە خووا داوا ئەکەم کە ئینشاالله بە ئارەزوت بگەی، خووا موبارەکی کات، منیش بۆ هەر

ئـــیش و کاریـــک کەهـــەت بێـــت ئامـــادەم» لـــە کێوەکـــە هاتبوینـــە خـــوڤاری کەوتبوینـــە ســـەر ڕێگـــا لـــە بـــەر ئـــەوە شـــەومان بەســـەر دا نـــەیت، بـــە تونـــدی ڕۆیـــشتین و کـــاتی گەیـــشتینەوە مـــاڵی، خـــوڤا حافیزیمـــان لەیـــەک کـــرد، مامەنـــد بـــە دەنگـــی بـــەرز هـــاوڤاری کـــرد:« ەحمـــوود ڕۆژی هـــەینیت لـــە بیـــر نـــەچیت» منـــیش وڵـــامم داوە و وتـــم : « بەســـەر چـــاو مامەنـــد گیـــان» ئیمـــڕو کـــە مـــن ئـــەم مەبەســـتە ئەنوســـم مـــاوەی چـــەڵ ســـاڵ بەســـەر ڕوداوەکـــە دا تیپـــەر بـــووە، مامەنـــد کـــوڕ و کیـــژی گـــەورە گـــەورەیی هەیـــە و کچـــی بـــە شـــو داوە و ژنـــی بـــۆ کوڕەکانی هێناوە.

لـــە پـــاش زەماوەنـــدی مامەنـــد هەباســـیش زۆری پینـــە چـــو نیـــازی قـــەبوڵ بـــو، بـــەڕەزای خـــوڤا لەگـــەڵ کیژکـــەی حـــاجی حەســـەن زەماوەنـــدی کـــرد و ئـــەمیش ســـی کـــوڕ و دو کچـــی هەیـــە، چـــوڤار پیـــنج نـــەوە دەوریـــان داوە ئێـــستا هـــەر ســـیکمان مـــوی ســـەر و ڕیـــشمان وەک بـــەفر ســـپی کـــردو وە لـــە مەرحەمـــەتی خـــوڤا ژیـــانیکی خـــۆش و پـــڕ لـــە ئاسایـــشمان هەیـــە و ســـاغ و ســـەلامەت ئـــەژین زۆر بەکـــەیفین ... و زۆر جاران خیر و خیرات بۆ پیرخدر ئەکەین.

بەشی شەشم



خوێنـــدەوارە بـــەڕێز و خۆشەویـــستەکان کارەســـاتی شـــیربایی بـــن و بنجینەیـــەکی قـــوڵ و کـــۆنی هەیـــە باڵـــام مـــن لـــەو بابەتـــەوە ئـــەوەی لەدەســـەڵاتم دابـــوو هێنـــدیکم بـــە زوبـــانی ســـاویلکە بـــۆ ڕۆن بونـــەوەی ئـــەم کارەســـاتە نوســـیوە و ئیخەمـــە بـــەر چـــاو، هـــەر چەنـــد بـــە قولێـــک ئـــەم نوســـینە کورتـــە دڵۆپەکـــە لـــە دەریایـــەکی پـــان و بـــەرین، شـــیربایی لەکەیـــەکی ڕەش و نالـــەبارە کـــە هـــەر وەک پینەیـــەکی چڵکـــن پـــاش مـــاوەی ڕۆژگـــارانی کـــۆن و زۆر لەمەوپیـــشە کـــە بـــە سەرشـــانی ئیمـــەدا داســـپاوە، فەقـــەت خـــوا ئـــەزانی ئیمـــە و بـــەرەی داهـــاتوی ئیمـــە ئـــەبێ چەنـــد ســـاڵی کـــە ئـــەم لەکـــە چـــەوت و ناحـــەز و نالـــەبارە بـــە دوایـــی خۆمـــان دا ڕاکیـــشین و لـــە بـــەر ئـــەم بابەتـــە قـــورس و چەپەڵـــە ســـەرمان داخـــەین، لـــە لای مـــن وا دیـــارە کـــە میـــژوی ئـــەم مەبەســـتە، بنەڕتەکـــەی زەمانێـــک بـــووە کـــە زۆر کـــەس هـــەبون و ئـــادمیزاد بـــون و هـــاتو چۆیـــان کـــردووە و خـــواردن و خەویـــشیان هـــەبووە و بەیکـــەوە وتوویژیـــان کـــردووە و بـــەڵام لـــە دونیـــای پـــان و بـــەرین دا لـــە بـــەر ئەمـــە چاویـــان بـــە باشـــی نـــەکرابووە نـــە هیچیـــان زانیـــوە و نـــە هـــیچ لـــەم کارەســـاتە حـــاڵی بـــون، مـــن نـــاڵیم خـــوای نـــەکردە هـــەمویان هـــەر وەهـــابون، یـــەک جـــار

زۆریشمان پیاوان و ژنانی ژیر و عاقڵ و زانا و تیگەیشتومان هەبون بەڵام زاناکان لە ترسی ناحاڵی و تینەگیشتوکان قوفڵی خامۆشیان و بێ دەنگیان لە دمی خۆیان داوە و لەگەڵ ڕۆژگار بۆ پیشەوە چون، تەواوی ئەم کارەساتە بێ گومان ئەبێ لە نەزانین و نەخویندەواری پیک هاتەبێ.

باسەکەمان بەم جۆرە دریژە پێ ئەدەین، زەمانیک کە زانست و عیلم بە پلەی وە ڕادەی ئیمڕو نگەیشتبو، لە ناوچەکانی کوردستان باو بو خەڵکی گوندەکان و بەشێک لە شارەکان لە بەر ئەوەی کە خۆیان گەرفتاری تەنگە و چەڵەمەی ژیان و مەینەتی و کەساسی بون زۆر بەی ئیش و کارەکانیان ئەسپارد بە دەستی پیاوە ڕیش سپێ کان و لە خۆیان ماقوڵتر بە بڕوای خۆیان ئەوان زۆر زانتر و زاناتر بون جا هەر ئەوە بو ئەم پیاوەماقوڵانە لە چۆنیتی هەر ئیش و کاریک بڕیاریان دابایە، خەڵکەکەش بە بێ لیکۆڵینەوە و قەس و باس، وتەی ئەوانیان قەبوڵ دەکرد و دەیان سەلماند، یەکی لەم کارانە چارەنوسی ژن هێنان و زەماوەند بو.

بۆ کوڕەکانیان یان بۆ کیژەکانیان لە پیش تەواوی ئیش و کارەکان ئەبوایە بە چن بۆ خزمەت ئەم پیاوە ماقوڵانە بۆ پرسین و چۆنیتی ئەم کارەساتە. ئەوان بون کۆ دەبونەوە و بڕیاریان لەسەر ئەم کارە دەدا و چارەنوسی ئەم دو لاوە ئەکەوتە بەر دەستی ئەوان،

ئـــەوانیش هـــەر چۆنیـــک بڕیاریـــان دابـــات، کارەکـــە بـــەم جـــۆرە پێـــک ئـــەهات، گرینگتـــرین باســـیان باســـی شـــیربایی بـــو، شـــیربایی زۆر قـــورس و گـــران ئـــەیان خـــستە ســـەر شـــانی مـــاڵی زاوا لەگـــەڵ خواردەمـــەنی ســـی شـــەو و ســـی ڕۆژ زەماوندەکـــە، جـــا ئـــەم شـــیربایە چـــە پـــارە و پـــوڵ بایـــە یـــان هـــەرچیکی کـــە، کـــە پیـــاوە ماقوڵـــەکان دیاریـــان دەکـــرد مـــاڵی زاوا ئەبووایـــە ڕازی بـــن و دەراوەکـــەیان بنـــاوی شـــیربایی بدابـــە بـــە بـــاوکی بـــوک یـــان دایکـــی بـــوک یـــان یـــەکی لـــە دم ڕاســـتەکەیان لەگـــەڵ تـــەواوی کـــەل و پـــەلی پێوســـتی ئـــەم ڕۆژە زەماونـــدە . ئـــەمجار زماوەندەکـــە پێـــک دەهـــات . بـــەڵام ئـــەگر مـــاڵی زاوا هـــەژار و دەســـت کورتـــو نـــەداربان ئـــەم پیونـــدە پێـــک نـــەدەهات و ســـەری نـــەدەگرت . ئەبووایـــە ئـــەم دولاوە دو دڵـــدارە بـــەبێ مـــەیلی و داخـــۆ حەســـڕت ســـەری دەســـت لـــە ئـــەوین داریـــو پێوندەکـــە هـــەڵگرن . هـــەتا کـــاتی مـــردن خفـــەتی لـــی دەســـت چـــونی یـــەکتر بـــەخۆن . زۆر دیتـــراوە و بیـــستراوە کەئـــەم جـــۆرە گرفتـــە بـــەخوین و خوینـــاو کێـــشراوە . لـــەم بابتـــەوە وەمبەســـتیکی ڕاســـتەقینە و کورتتـــان بۆ باس دەکەم .

وا دەگێڕنـــەوە لەگونـــدی باریکـــەدار لـــە ناوچـــەی .... خـــدر و ئەســـتێی دولاوی تـــازە پێگەیـــشتو دڵـــداری یـــەکتر دەبـــن و یـــەکتریان زۆر خـــۆش ئـــەویت چەنـــد ســـاڵ بـــو دڵیـــان بەیکـــەوەبو وە ئـــاوات و ئـــارەزوی ڕۆژی زەماونـــدیان هـــەبو. بـــەڵام بڕیـــار دانـــانی شـــیربایی لـــەلایان پیاوەماقوڵکـــان

بۆ ماڵی خدر نەگونجاو ئەم دو لاوە بەمرادی دڵیان نەگەیشتن هەردوکیان بە ڕۆژیک خۆیان دەکوژن . باسەکە بەوردی بەم جۆرە بو . خدر کوڕیکی جوامیرو باڵا بەرز و چوار شانە ڕێک و پێک و لاویکی خوین گەرم و بیرو باوڕ پاک و خۆشەویست بو . لەزۆر ئیش و کاردا یارمەتی دەری زۆر کەسان لەناو ئاوایکە دابو . ئەم لاوە ژیکەڵەو جوامیرە ماوەیەکی زۆر بە دڵی دابو بە ئەستی کچەکەی مام شەریف . ئەستێش بەڕادەیەکی زۆر خدری خۆش ئەویست . باسی ئەوین و دڵداری ئەم دو لاوە جگە لەمە تەواوی ئاوایەکەی خۆیان ئەیزانی ، زۆر لە گوندەکانی دەوربەریش لەم باسە ئاگادار بون کاتی ئەم دو لاوە دڵدارە لە ڕێگای مەزرا یان لەسەر کانی چاویان بەیەک ئە کەوت وتوویژیان ئەکرد . زۆر لە ژنان و کیژو لاوەکان کەئەم دیمەنەیان ئەدی لەخووا ژیانیکی پڕ لە خۆشیو سەربەرزیان بۆ ئەم دو ئەوین دارە داوا ئەکرد . ڕۆژیک خدر و ئەستی لەقەراخ ئەستیریک دور بەدور ڕاوستابون و وتوویژیان ئەکرد ، پورە نازدار لەگەڵ چەند ژنی کە دەڕۆیشتن بۆ مەزرا . چاویان بەم دو دڵدارە کەوت . ڕاوەستان و پورە نازدار ڕوی تێکردن و وتی ڕۆڵەکانم هێوام ئەویە بەیەک بگەن و خیرو خۆشی لە عومرو ژیانتان بەدینن . خدر پێکەنی و وتی دایەگیان خووا ئەزانی و قسمەت . ئەستی وتی دایە نازدار من و خدر پەیمانمان بەیکەوە

بەستووە ئەگەر لەم دونیایەش بۆ یەک نەبین لەدونیای کە بەیەک ئەگەین . لەو کاتەدا پورە فاتم یەکی لە هاوڕێکانی دایە نازدار بەتۆریەوە وتی تۆ خووا ئەستی سەری زمانت بگەزە . بەهومیدی خووا لەم دونیایە بەیەک ئەگەن . من زۆرم دڵداری وەک تۆ و خدر دیوە لەم دونیایە بەیک گەیون . هیوام ئەوەیە ئیوەش بەیەک بگەن . بەڵی خوشەویستان ماوەیەک بەسەر چو شەو هات و ڕۆژ بۆوە . شەو ڕۆیشتو ڕۆژ هەلات . زەمان لەسەر ڕەو ڕەوەی ژیان هەر وەک تیری تاعون بەرە و پێشەوە ئەڕۆیشت و خەڵکی گەورەو پچوک و پیرو لاو هەر کام سەر شوینی ژیانی دیاری کراو بە ڕێگای پڕ لە کۆسپ و تەنگو چەڵەمەی ئەم ژیانە نالە بارەیان دەریژەیان پێ دەدا . کەس کاری بەکەس نەبو ، هەر کەس لەبیری ژین و ژیانی خۆی دابو . هەتا ڕۆژیک لە ڕۆژان خدر ئەو بارە قورسەی کە وا لە ناو دڵی دابو . بۆباس کردن . دایکو باوکی خدر بەم مەبەستە زۆر خۆشحاڵ بون . لەپاش باس کردن لەگەڵ ماڵی ئەستی ، پیاوە ماقوڵەکانیان لەم کارە خیرە ئاگادار کرد . بە کورتی لەپاش هاتو چونیکی زۆر شیربایە دیاری کراوەکە ئەوندە قورس و گران بو بە هیچ جۆر هەتا بە فروشی مەزرا و مەڕو ماڵات و کەلوپەلی ماڵە کەیان ئەم پارە و پوڵەیان بناوی شیربایی بۆیان جۆرنەدەبو . لەگەشت لاوە ماڵی خدر هومیدیان بڕا و تەواوی هیواو ئاواتەکەیان گەیشتە ڕادەیەک کە بە

قەولیک دەستیان لە هیچ جێگایەک بەند نەبو . لەناچاری ماڵی خدر لەم زەماوندەی ئەم دو دڵدارە کشانەوە پاش ... خدری لیقەوماو کزومات دڵگیربووە... ڕەنگی بزرکا خویناوی دڵی ئەخواردەوە. ئەستی و خدر بەم هەمو ئەوینە لەیەک دور کەوتنەوە . ماوەیەک خدر و ئەستی چاویان بەیەک نەکەوت و ڕۆژیک ئەستی خۆی گەیاندە خدرو پێشنیاری کرد خدر هەڵی گری و لەم گوندە دور کەونەوە بەڵام خدر لەبەر ئەوەی خۆی بە پیاو ئەزانی و لاویکی جوامیرو ئابڕودار بو ئەم پێشنیارەی پەسەند نەکرد . لە پاشان هەردو کیان بەیکەوە دەستیان کرد بە گریان ، زۆر گریان و زۆر خەفەت بار بون . ئەمجار خدر روی کردە ئەستی و وتی ئەستی تو وتەی ئەورۆژەت وەبیردیت ، وتت دایەنازدار ئەگەر لەم دونیایە بۆیەک نەبوین لەدونیای کە بەیەک دەگەین ئەستی لام وایە هەرواوامان بەسەردیت ، من خوواحافیزی لەتۆدەکەم ، لام وایە ئیتر لەم دونیایە یەکتر نابینینەوە. هەمیسان دەستیان کرد بەگریان و فرمیسکی گەرم بە چاوەکانیان دا ئەهاتە خووار ئەو ڕۆژە نیزیک کاتێک بەیەکەوە وتوویژیان کرد . بەچاوی گریانەوە لەیەک جیا بونەوە... خدر لەبەر پاریزگاری ئابڕو وە شەڕەف و ناموسی خۆی و بنەماڵەکەی وەڕیزگرتن لەئابڕوی ئەستی ، شەو کاتی خەوتن خەیاڵیکی سامناک بە مێشکی داهات و هەرچی کرد خەو لەچاوانی

نەکەوت ڕابردوی ژیانی هەر وەک پەردەی سینەما ئەهاتە بەر چاوی ، هەوەڵین ڕۆژی ئاشنا بون لەگەڵ ئەستی ، ڕۆژی خوازبینی ، هاتو چوکردەنی دایک و باوکی و وتوویژی دوایین لەگەڵ ئەستی و... ئەوشەوە هەتا بەری بەیان خدر نەخوت کاتی شەو ئەیەویست تەمی تاریکی خۆی بە ڕۆناکی ڕۆژ بە گۆڕیتەوە خدر بە ئاسپایی لە ناو جێگاکەی ڕاست بووە زۆر بە هێدی جەلو بەرگی کردە بەر ، چاویکی جوانی بە ڕواڵەتی دایک و باوکە پیرەکەی و خوشکەکانی دا کە لە خەوی شیرین دابون گێرا هەناسەیەکی ساردی بە چاوی پڕ لە فرمیسکەوە هەڵ کێشاو هیواش لەماڵەوە دەرکەوت . لەبەر ئەوە زۆری بۆ بانگی بەیانی نەمابو ،قولەقولی کڵە شیرەکان لەزۆر ماڵان بە گووی دەگەیشت .... خدر ڕێگای داگرت و ڕۆیشت لەگوندەکە دەرکەوت کزەی بای بەیانی لەدەم و چاوی دەدا . ماوەیەک ڕۆیشت هەتا گەیشتە ئەو جێگایەی کە لەناو دڵی دا بناخەی دانابو بە ئاسپایی لەکێوە کە سەرکەوت هەتا گەیشتە بەرزترین لوتکەی کێوەکە . ئەمجار قەدەریک ڕاوەستا لە پاش ماوەیەک سەری هەڵبڕی و روی کردە ئاسمان . ئاسمانی پان و بەرین کە ئەستیرەکان هیشتا دروشمی جوان و ڕوناکیان لە دەست نەدابو . خدر چاوەکانی پڕبون لە فرمیسک . پڕ بە دەم هاواری کرد ئەستی ... ئەستی کیژی پاک و دڵداری خۆشەویستم من ئەوە

ڕۆیــشتم هێــوام وایــه تــۆش بەشــوینم دابێــت . لــەم دونیایــه بــۆ یــەک نــەبوین بەڵکــەم لــەدونیای کــە، کــەجێگای ژینــی ڕاســته قینەیــه بەیــەک بگــەین . خــدر بــەدڵ و جگــەریکی وەک پــۆلا و قــورس و پتــەو کــەناو دڵــی پڕبــو لەخەفــەت و زو خــاو لەســەر لوتکــەی کێــوە بەرزەکــە خــۆی هەڵداشــت و ... لــەناو خــوینی گــەش و ئــالی خویــدا گــەوزی وە گیــانی پــاک و خــاوینی خــۆی کــردە یاســایەکی بــێ بنکــه و بــێ بــایخ، یــانی شــیربایی کەچەنــد کەســی نــەزان و نەخوینــدەوار بنــاوی پیــاوە ماقوڵــەکان کــە بنەڕەتــەکیان داڕشــتبو. بــەیانی کــە خیزانــی مــاڵی خــەبریان دەبتــەوە چاویــان بەخــدر ناکــەویت و جێگاکــەی چــۆڵ دەبیــنن لەبابــەت ئــەوە زۆر پــەڕوش دەبــن. ئەکەونــه نــاو دیــی بــۆ هــەواڵ پرســین ، کــەس هــەواڵی خــدر نــازانی تــەواوی خــەڵکی گوندەکــە ئــەم خەبــەرە ئەبیــستن زۆر نیگــەرانی ئــەبن و دڵ بەخــەم زۆر لەخەڵکەکــە خۆیــان ئامــادەکردو هــەتا بەشــوین خــدر دا بگــەڕین کــاتیکی زۆر بەســەرچو بــەڵام هــەواڵی لــە خــدر نــەبو خەڵکەکــە بــە دڵ ســاردی گڕانــەوە. لەبــەر هێــوانی مزگەوتەکــە ڕاوەســتان زۆر دڵ پــەڕوش و نیگــەرانی خــدر بــون هــەرکامیان بــەجوریک باســی ئــەم مەبەســتیان ئــەکرد . لــەو کاتــەدا بــو کــە حەمــەی شــوانی ئاوایەکــە بــەپڕتاو هــاواری هێنــاو وتــی خــدر ... خــدر... یــەکی پرســی وتــی حەمــە خــدر چــی ؟ حەمــە وتــی خــدر لــەژێر کێــوەڕەش لــە نــاو خــوینی خۆیــدا گــەوزیوە . هــەوەڵێ خەڵکەکــە واق

مـــان و دەســـتیان شـــەل بـــووە . هـــەتا مـــام رەحـــیم هـــاوّاری کـــردو وتـــی بـــابڕوین بـــزانین چـــی قـــەوماوە جـــەماعتیکی زۆر ژن و پیّـــاو گـــەورە و پچـــوک بـــەڕاکردن خۆیـــان گەیانـــدە بنـــاری کیّـــوەڕەش ، تەماشـــا دەکـــەن بـــەلیّ ڕاســـتە ئەمـــە تـــەرمی خـــدرە ، خـــدری کـــوڕی ســـوّارە . بـــاوکی خـــۆی بەســـــەر تەرمەکـــەدا کیّـــشاو هـــاوّاری کـــرد خـــدر... خـــدر فرمیـــسکی گـــەرمی بەســـەر ڕیـــشە ســـپیەکەی داهاتـــە خـــوّار لـــەپاش ماوەیـــەک گریـــان و هـــاوّار خـــەڵکی تەرمەکـــەیان خـــستە ســـەر دەســـتیان و بـــەڕو ئـــاوّایی کەوتنـــــەڕی . هـــــەتا گەیـــشتنە نـــاو حەوشـــەی مزگەوتەکـــە لـــەپاش ئـــەنجامی کارەکـــانی شـــەرعی گۆڕیـــان بـــۆ ئامـــادە کـــردو تـــەرمی پـــاکی لاوی جوّانـــە مـــەرگ و بەشـــەڕەف و بەناموســـی خـــدری کـــوڕی ســـوّارەیان خـــستە نـــاو گـــۆڕی ســـاردەوە ... ئەســـتی کـــاتی ئـــەم کارەســـاتەیی ئەبیـــستی و بـــەچاوی ئـــەبینی ئەوشـــەوە هـــەتا ڕۆژ لـــە تـــاوی خـــدری جوّانـــە مـــەرگ ئـــیش و کـــاری گریـــان دەبـــیّ، خـــەو بەتـــەوّاوی لـــە چاوەکـــانی حـــەرام دەبـــیّ، زۆر بیردەکاتـــەوە بیـــر لـــە خـــۆی بیـــر لـــە خـــدر لـــە ژیـــان .لـــەپاش خـــدر دابـــو ئـــەمجار بیـــری لـــە قـــەولْ و بەلیّنەکـــەی کـــردەوە کـــە بـــە خـــدری دابـــو، زۆری بیـــر کـــردەوە بـــەڵام وّای بـــەباش زانـــی بەقـــەولی خـــۆی وەفـــا بکـــات ئەو شەوە هەتا ڕۆژ خەو لە چاوّانی نەکەوت و ....

هـــەر وّەک دەزانـــــین لەتـــــەوّاوی گونـــدەکان لەناوچـــەی کوردســـــتان ژنـــان بـــەیانان زۆر زو لـــە خـــەو هـــەڵ دەســـتن و تەنـــدور دادەگیرســـینن بـــۆ

نـانی تـازەی ڕۆژانـە. ئەسـتی ئـەو ڕۆژە زوتـر لـە ڕۆژەکـانی پێـشو لـە نـاو جێگاکـەی خـۆی هەسـتاو هاتـە دەرو ڕۆیـشت خریکـی داگیرسـاندی تەندورەکـە بـو بـەلاّم تینـی تەنـدوری ئـەوڕۆژە لـە گـەڵ ڕۆژانـی پێـشو زۆری فـەرق ئـەکرد. ئـاگری نـاو تەنـدوری ئـەو ڕۆژە لـە ڕۆژانـی تـر زۆر بـەتین تـر بـۆ. کـاتی تـەواوی بڵێـسەی ئاگرنـاو مربەقەکـەی داگـرت. ئەسـتی سـەری هـەڵبری وە روی کـردە ئاسـمان و هـەر خـوا ئـەیزانی لـەناو دلـیٚ خۆیـدا چـی ئـەوت. فرمیـسکی گـەرمی بـەچاوەکانی دا هاتـە خـوار و هـاواری کـرد، خـدر .... خـدری خۆشەویـستم ئـەوەمنیش پـەیمانی خـۆم بـردە سـەر و بەشـوینت دا هـاتم. خـۆی خەسـتە نـاو تەندورەکـە و گـڕی تیبـەربو ئـاگری گـرت تـەواوی لەشـی سـوتاو هـەڵ قرچـا. لـەهاواری ئەسـتی بنەماڵەکـەیان لەخـەو ڕادەپـەڕن، بەپەلـە خـۆدە گەینـە سـەر تەندورەکـە. کـاتی ئەگەنـە سـەر ئەسـتی کیـژی بـیٚ مـراد و دڵ پـڕ لـە هومیـدو ئـارەزوی ڕۆژانـی داهـاتو، ڕوحـی پـاکی پـەڕوازی کـردووە بـۆ ئاسـمان. بەهـەرجۆریک ئـەبێت ئاگرەکـە دەکوژێنـەوە تـەرمی سـوتاوی ئەسـتی کـە وەک خـەڵوزی لـی هـاتبو لـەناو تەندورەکـە دەر ئـەهێنن و کفنـی دەکـەن و لەگـەڵ ئاوایەکـە گۆریـان لـەلای گـۆڕی خـدری بـە ئـاوات نگەیـشتو بـو ئامـادەکردو وە لەناو گۆڕی ساردو تاریک دا ناشتیان ...

بەڵی خوێندەواره خۆشەویستەکان ئەمە پچوک ترین مەبەستیک لە مەبەستەکانی شیربایی کەلەم ڕوداوانە لە ناوچەکانی کوردستانی سەرسەوز و پان و بەرینی ئیمەدا روی داوە. ئیمڕو بۆ هەمومان ئاشکرایە کە ئیمە لە عەسرو زەمانیک دا دەژین و ژیان دەکەین کە بە دەستی ئادەمیزاد نیوەی کۆراتی ئاسمان داگیر کراوە. ئیمڕو عیلم و زانست بە ڕادەیەک گەیشتووە کە دوکتۆرە زانا کان و عالم و ئاگادار دڵی ئینسان کە گەورەترین مایەی ژینی هەرگیان لەبەریکە لەناو قەفەزی سینگی دەردەهێنن و لولەکانی ئالۆ گۆڕدەکەن وە لەمردنی ڕزگار دەکەن . گورچیلەی ئینسان ئەمڵ دەکەن میشکی ئینسان کەگەورەترین کامپیوتێری گیانی ئادەمیزادە عیلاج و چارەدەکەن و ... وڵاچاکە ئەم باسە جاری لێرەدا ڕاگرین و. باسی پێشکەوتی زانایانی کورد بکەین . ئیمڕو لە سایەی خوواوە. دونیا لەعیلم و زانست لەڕادە بەدەر پێشکەوتووە. ئیمەش میلەتی کورد لەم کاروانە بە دووا نەکەوتوین ئەتوانم بە شانازیوە داوا بکەم ئێستا میلەتی کورد نزیکەی حەفتا و پینج لەسەد هەتا زیاتر خوێندەوارن بەشی زۆرمان لە قوتابخانەکان لە زانستەکان لە زانکوکانی ئیران و وڵاتەکانی دەرەوەی ئیران ماموستانو و دەرس ئەدن وە زۆر لە پیاوەگەورەکانی کورد لە کارخانەکان وە کارگاکان ئیران و دەرەوەی ئیران لەعیلمی فیزیک ، کیمیا، وەزانستی و

دوکتـــوری ، دڵ، گورچیلـــه ، مێـــشک ، عەســـەب و ... و لـــە نەخوشـــخانەکانی ئیـــران و ئـــەڕوپا خـــەریکی خزمـــەت بـــە خـــەلقی خـــودان و خـــەریکی ئیـــشو کـــارن . ئیمـــڕو ئیمـــە بـــە ســـەر بـــەرزیوە داوا ئەکـــەین پیـــاوە گـــەورەو پەلـــە بـــەرزەکانمان بـــەناوی زانـــا ، شـــاعیر ، نوســـەر وە.... مـــان هەیـــە نەتـــەنیا لـــە ئیـــران بەڵکـــەم لـــە وڵاتـــە پیـــشکەوتوە کـــانی دەرەوەی ئیـــران نـــاو دارن و نـــاو بانگیـــان هەیـــە کـــە تـــەواویان جیگـــەی ســـەر بـــەرزی و ئیفتیخـــارن بـــۆ میلـــەتی کـــورد . بـــەلاّم هەمیـــسان گرفـــت و چەڵمـــەی شـــیربایی و ژن بەژنـــە لـــە زۆر جێگایـــان هـــەروەک پێـــشو مـــاوە . زۆر کـــەس لـــە ژیـــر ئـــەم بـــارە قورســـو گرانـــەدا قـــەدیان چـــەماوە ســـەرەڕا مەبەســـتی شـــیربایی مەســـەلەی ژن بەژنـــە زۆر زۆر لـــە کارەســـاتی شـــیربایی ناحـــەزترو ناپەســـەند تـــرە، کـــە لـــە نـــاو ئیمـــە دا بـــاوە. بـــە بڕوایـــی مـــن ئـــەمیش هـــەروەک شـــیربایی میژویـــەکی کـــۆنی هەیـــە. ئیـــستاش تـــەواوی میلـــەتی کـــورد بـــە تیکڕایـــی گـــەورەو پچـــوک ، لاو و پیـــر ، خوینـــدەوار و نـــەزانن . ئـــەم ئـــاڵو گۆرەیـــان زۆر پـــێ ناحـــەزو چـــەوت و نالـــەبارە . بـــەلاّم مـــن نـــازانم بـــۆچ کـــەس دەنگـــی دەرنایـــەت ، بـــە قـــەولیک ( ئیمـــەش و ئـــەوان خۆمـــان لـــە کوچـــەی عـــەلی چـــەپ داوە ) . ئەگـــەر بـــەوردی چـــاو لـــە میـــژوی پـــڕ بایـــەخی خۆمـــان بکـــەین و بڕوانینـــە ئـــەم فەرهەنگـــە پـــڕ لـــە بەرەکەتـــە وە پێـــشکەوتوی زانـــست و ئاگـــاهی کـــە ئیمـــڕو هەمانـــە . بـــە وردی بڕوانینـــە ئـــەم بیـــرو بـــاوەڕە گرینگـــەی کـــەخووا

پـێ داویــن هەمیــسان لــە بابــەتی ئــەم دومەســەلەیە زۆر وەدواکــەوتوین . کەواتــە خوینــدەواری بــەڕیز و خوشەویــستم ئیمــەی میلــەتی کــوردی زانــا و نەبــەزو ڕوشــن بیــرو تیگەیــشتو ، هەتاکــەی ئــەبێت لــەم خــەوە قورســـو گرانــە خەبــەرمان نەبێتــەوە. ئایــا کــاتی ئمــە نەگەیــشتووە بەتــەواوی چاوەکانمــان بکەینــەوە و زۆر بــەوردی بڕوانینــە ئــەم دو مەبەســتە لــە نــاو ناوچەکــەمان لام وایــە باشــتر ئمەیــە گەشــتمان دەســت بەدەینــە دەســتی یــەکترو ئــەم دو مەســەلەیە بەچەشــنیک حــەل بکــەین و هــەزاران کیــژو لاو چــاویڕوانی ئــەوەن کەشــیربایی و ژن بەژنــە لــە نــاو کوردوســتان لــە نــاو بــەچی . هــەتا ئــەوان بــەتوانن زەماونــد بکــەن و بــەدلیکی پــاک و خــاوین بــە مــراد بگــەن و ژیــانیکی سەربەســتی بــە ئــەوین و دلــداری بــۆ خۆیــان پیــک بــەهێنن ببنــە خــاوەنی مــالو و ژیــان و چەنــد منــالی کوڕپــەو جــووان بــۆ مــانی نەتەوەکــەمان بــاقی بــەمێنی بــەلام کۆســپی شــیربایی کەبۆتــە کیــویکی گــەورە و لاقــاویکی ســامناک پێــشی ئــەم پیگەیــشتنەی گرتــووە. لــەپاش مەســەلەی شــیربایی باســی مــارەیی دەکێــشنە پــیش . ئایــا ئــەزانن لــە عەســری پیــشکەوتوی ئیمــڕودا مــــارەیی گەیــشتۆتە ڕادەی چەنــد میلیــون( هــەروەکو، مــالکرین ، دوکــان کــرین ، ماشــین کــرین ) وە ... هەرلەبــەر ئــەم کۆســپە کۆنــو نالــەبارەی ڕابردوەکانــە. ئیستاش پەیوەنــدو ئــەوینی لاوەکــان بــە ئــەنجام ناگــات وە لــەئاکام دا نــاکۆکی و دوژمنایــەتی لــەناو هــەردو بنەمالــەکان

پێــک دیــت . لــەم بابەتــەوە زۆر دیتــراوە وە بیــستومانە لەســەر ئــەم مەبەســتە ناحــەزو دوژمنایــەتیکی قورســو گــران پێــک هــاتووە و لــە هــەردو بنەماڵــەکان زۆر کــەس کــوژراون . و ئــەم دوژمنایــەتیظ هــەتا زەمــانیکی زۆر دریــژ هــەبووە و هــەر مــاوە. خوینــدەوٚاری بــەریزم مــن نــازانم مانــای شــیربایی چیــە وە ئــەم وشــە چــەوتو نالــەبارە لــەکام میــژوی دونیــاوە وەدەســتی میلــەتی کــورد کــەوٚتووە. لام وٚایــە کــەس نــازانی لەچــەکات وزەمانیــک شــیربایی بــەدی هــاتووە ئیــستا بــۆ ئیمــە ڕون بوٚنــەوە وەبــاش ئــەزانین کــەزاوٚاش هــەروەک ئــەولادی ئیمــە وٚایــەو ئــەویش وەک کچەکــەمان دەبێتــە جگەرگۆشــەی ئیمــە کەوٚاتــە لــە بــەر چــی دەبــیٚ پــەڵپو بیــانوی پــیٚ بــەگرین وە زاوٚاکــەمان بخینــە ژیــر قــەرزو قوڵــەو لەبــەر قــەرزداری و نــەداری ژیــانیکی پــڕ لــە تــەنگو چەلەمــەو هەناســە ســاردی بەرنەســەر. بــوٚچ ئــەبێت ئــەم جــورە دایکــو و باوکانــە بیــر لــە ژیــانی ئــەم دو لاوە تــازە پیگەیــشتووە نەکەنــەوە ... جــا هــەر ئمەیــە کــە لــە زۆرتــرین پەیوەنــد لەبــەر قــەرزو قوڵــە ژیــان بــۆ ئــەم دو لاوە تــاڵ دەبــیٚ و شــڕو کێــشە لــەپاش ماوەیــەکی نــە زۆر دور لــە نــاو ئــەم دووٚانــە پەیــدا دەبیــت و هومیــدو بەختــەوەری لەماڵەکــە کــوٚچ دەکــات . ئــیش و کاریــان بەمەحکەمــە دەکیــشی و قەباڵــەی مارەیەکــە دیــنن بــۆ لای دادرس . ئــەمیش بەرامبــەری بەڵگــەِ دیــاری کــراوی مــارەیی فــەرمان دەبڕیــت و ... هــەزارو یــەک مەبەســتی کــەش دێتــە پــیش . بــەلاٚم ئەگــەر

ئیمە بەوردی لەم ڕوداوە بکۆڵینەوە بۆمان دەردە کەویت کە ئەم هەمو ناکۆکی و تەنگوچەڵەمەیە لە شیربایی و مارەیی زۆر پێک دیت . ئەگەر ئەم کوڕە لاوە لە ڕوی ناچاری و کەساسی نەجوبایە ژێر ئەم بارەگرانەوە لە دەمی خۆیو ژن و منداڵەکەی نەگیرا بایەوە بۆ قەرزو قوڵەی شیربایی و زەماوەند ، دەست کەوتەکەی کەتەواوی بۆ ماڵ و منداڵی خەرج ئەکرد و ژیانیکی خۆشو پڕلە ئاسایشیان دەبو و بەخۆشیو کامەڕانی ڕایان دەبوارد و ناکوکی نەئەهاتە پێش . هەمومان زۆر باش ئەزانین لەژیانی پڕ لە مەینەتو دەردەسەری ئیمڕو ، زۆر کەس هەن بەقەولیک لە سیٚ بەشی ژیان بەشیکی بۆجۆر نابێت ، چۆن ئەتوانی خۆی بخاتە ژێر باری قورسو نالەباری شیربایی ژن هێنان . ئیمڕو زۆر لە لاوەکان گەیشتونە پلەو ڕادەیەک کە ئامادەن بۆ زەماوەندو پێک هێنانی ماڵو وخیزان بەلاٚم بۆ ئەنجامی ئەم کارە پیویستیان بە پارەو پولیکی زۆر هەیە . لەو بابەتەوە تەواناى ئمەیان نیە کەهەنگاوی پێویستی بۆ زەماوەند هەڵ بهینن. پرسیار دەکەن ئەبی چی بکەین هەتا ئەم گەرفتو ناکۆکیە لە نالو بەرین . چەڕێگایەک بەدەست بێنین تا بە بینە خاوەنی ژن و ماڵ . زۆریان سەرە گیژەیان گرتووە ، نازانن چی بکەن هەتا بەمراد بەگەن . بەتەنیا هەر کوڕە لاوەکان نین بەم دەردە گرفتارن بەڵکە زۆر لە کیژەکان کە پێگەیشتون و هەڕەتی شوکردنیانە ئەوانیش

هــەروەها لەبــەر شــیربایی و مــارەیی زۆر لــە ماڵــەوەدا ماونــەوە. دڵیــان لــەژیان و خۆشــی دنیــاوژین بڕیــوە بــەداخ و حەســرەتەوە تەماشــای سینەمای ژیــان دەکــەن . زۆریــش هــەن لــەلاوو کیژەکــان لــە بــەر ئــەوە بــە مەقــسودو مــەرامی دڵیــان ناگــەن . پــەنا بــو خۆاردنــەوەی ژاراو دەبــن و خۆیــان دەکــوژن و داخــو دەردیکــی گــەورە ئەخەنــە نــاو دڵــی دایکــوو بابیــان وکــەس و کاریــان . لێرەدا مــن پرســیار دەکــەم بــۆچ ئــەبی وابیــت ؟ ئایــا ئەگــەر ئیمــە بــە وردی وەلــە قــولای دڵــەوە بیــر لــەم ڕوداوانــە بکەینــەوە ، بۆمــان دەرناکــەویت کــە تــەواوی ئــەم هــەمو خۆکــشتنو دوژمنایەتیــە و شەمــشیرو تیــر لەیــەک کێــشانەلەناو دو بنەماڵــەدا هــەتامالڵ شــیواوی ،ئــاوارەبونی منالــە بەتاوانــەکان و دەربــەدری و لیقــەوماوی هــەموی ســەرچاوەکەی لەبنــەڕەتی شــیربایی و مــارەیی زۆر بــەدی دیــت و ... ڕودەدات ئەگــەر ئیمــە لــە عەســری پێــشکەوتوی ئیمــڕودا تۆزیــک تــەنیا تۆزیــک لــەڕوی عــەقڵ و فــەهمی خۆمــان بیربکەینــەوە وەلــەم خــەوە قورســە خەبەربینــەوە لــە بابــەت ئــەم دو مەبەســتە ناڵــە بــارە کــەمێک لیبوردنمــان هــەبێت بەقــەولیک تۆزیــک ئــەم مەســەلەیە شــەل بگــرین هــەرگیز تۆشــی ئــەم مەینــەتی و تــەنگوو چەڵمەیــە نــاین . هــەرگیر کوڕەکــان و کیژەکــان کــە پــارەی دڵ و جــەگر مــانن ئایــا لــە نــاودە چــن ئایــا ماڵیــان دەشــیوی . ئایــا منالــەکانیان دەربــەرو ئــاوارە دەبــن. ئایــا ئیمــە توشــی دەردو داخ ئــەبین ئایــا کوڕوکچــەکانی

خیرو خۆشی لە خۆ نەدیو بەدەستی خۆمان گۆڕیان بۆ هەڵ ئەکەنین هەتا کاتی مردن ئیمە داخ بە دڵ بین . خویندەوارە بەرێزەکان ، دایکو باوکە فیدا کارو بە شەڕەفەکان ، زانایان و ڕۆشن بیرەکان ، ڕیش سپی و پیاوە ماقولەکانی عەسری ئیمڕو، ئەی ئەو کەسانەی عاقەڵن و هۆشیارن ولەئیمە زۆرترداناترو زانا ترن. عالەمن ، ماموستان ، زانایانی دینن، خواپەرست و موسڵمانن ، من لە هەموتان پڕ بە دڵ داوادەکەم ، ئەبێت ئیمە چی بکەین هەتا بتوانین بە سەر شانی ئیمەدا گەرفتو و شێوە ناحەزو نالەبارەکە لە زەمانیکی زۆر کۆن بەسەر شانی ئیمەدا داسەپاوە وەهەروەک پینەیەکی ڕەش بەشانی ئیمە داناسوە. چۆن لەسەر شانی خۆمان و ناوچەکانی کوردستانی جوان و پاک و خاوین لابەرین و خۆمان بخینە ریزو ناو جەرگەی کەمەڵی پیشکەوتوی ئیمڕو چۆن ئەتوانین دەرمانیک بۆ ئەم برینە پڕ لە دەردو ناکۆکیە بدۆزینەوە و خۆمان ڕزگار کەین . ئیمڕۆ لاوەکانمان لەکوڕو لە کەچ ، چاوەڕوانی بیرو هۆشی ئیمەن کەبەڵکەم بە توانن بەهاسانی بەمرادی دڵی خۆیان بگەن وە بە ڕادەی خۆش بەختی و دامەزراندنی ئاسایش و پێک هینانی ئاوات و ئارەزویی خۆیان بگەن . ئینشا الله.

مانگی ڕەشەمەی سالی ١٣٦٢

## بـــاران

بەشی حەوتم

باران

٧

ئـــەو ســـاڵە گـــەلیک لـــە دانیـــشتۆکانی ئاوایـــەکان لـــەوەرزی بـــەهار دا زەویکـــی زۆریـــان شـــیو کـــرد بـــوو، لـــە ســـاڵی پێـــشودا تـــۆویکی زیاتریـــان بڵـــاو کـــرد بـــووۆوە بـــە هومیـــدی دەســـت کـــەوتێکی پتربـــون، بـــەڵام نـــەبارینی بـــاران لـــە کـــاتی خۆیـــدا خـــەم و خەفـــەتێکی گـــەورەی خـــستبو نـــاو دڵـــی گەشـــتیان ، شـــەو و ڕۆژ لـــە نـــاو مزگەوتەکانـــدا دەســـت بـــە دوعـــا بـــون و لـــە خـــووا ئەپاڕانـــەوە چونکـــە چەنـــد ســـاڵ لـــە مـــەو پـــێش وشکەســـاڵ بـــو، چـــەیان وەدەســـت نەکـــەوتبو، توشـــی زەر و زیـــانیکی زۆر ببـــون، لـــەوە ئەترســـان کـــە ئەمـــساڵش وشکەســـاڵ بێـــت و توشـــی تەنگـــەو چەڵەمە بن.

ئـــاوایی چنـــارانیش بـــەم دەردە گرفتـــار بـــو، لـــەم ناوچـــەیش هـــەر وەک ناوچـــەکانی کـــە بـــاران نـــەباری بـــو خەڵکـــەکان زۆر خـــەمناک بـــون لە تـــەواویان زیـــاتر کـــاک رەســـول بوکـــە لـــە نـــا بـــارینی بـــاران دڵ بـــە خـــەم و پەروشـــتر بـــو، وڵـــات تاریـــک ببـــو ئیوارەیـــەکی درەنـــگ بـــو کـــاک رەســـول لەنتەرەکـــەی داگیرســـاند و لـــە بـــەر هیـــوانی پـــێش هۆدەکـــەی دانـــا و ســـەری بـــەرز کـــردەوە ڕوانیـــە ئاســـمان بـــەڵام پەڵەهـــەوریکی لـــە

ئاسمانی پان و بەریندا وە بەر چاو نەهات، هەناسەیەکی ساردی لە ناخی دڵەوە هەڵ کێشاو سەری داخست، خیزانی حەسیرەکە ڕاخست و لەلای شانیەوە دانیشت، ڕوی تێکرد و وتی : « ڕەسو چی تە؟ بۆچ وا داماوی؟» کاک ڕەسول سەری هەڵبری و وڵامی داتەوە بەڵام چی نەگوت، هەمیسان ڕوی کردە ئاسمان و لەبەر خۆیەوە وتی : « نا ... باران ناباریت، چاوەکانی پێک داداو دەستەو ئەژنو دانیشت، تەنیا وزەوزەی میشولەیەک بو کە لە دەوری لەنتەرەکە ئەخولایەوە ... خێزانی هەستا سفرەکەی داخست و لەنتەرەکەشی لە لای سفرەکە دانا، کاک ڕەسولیش لە تەنیشت سفرەکە دانیشتبو دمی کرابووە و چاوەکانی پڕ لە خەم بون، تاوتاو سەری هەڵدەبڕی و چاوی لە ئاسمان دەکرد، ڕوی لە ئاسمان وەرگێراو تەماشای ڕوناکی لەنتەرەکەی کرد کە ڕوناکیکی زەردی بەسەر سفرەکە دا بڵاو کردە بوّوە، کاک ڕەسول کابرایەکی کز و لاواز بو لە بەر بێ گۆشتی دم و چاوی تەنیا شەتیکی کە بە جوانی دەبیندرا لوتی بو کە لە سەر دم و چاوی قیت ببووە وا دیار بو کە خەم و خەفەتیکی کۆنی لەڕابردو پێشان دەدا، پەشیلە پیر و لاوازەکەشیان لە لای سفرەکە چمۆڵەی دادابو، بەکرو شماوی خۆی مات کردبو، چاوەکانی بڕیبووە ناو سفرکە، جار جار لە نوری

لــــەرزیوی فانوســـــەکە کـــە لـــە چـــاوە ســـەوز و قاشـــولەکانی دەدابروســکەی لــی پەیـدا ئـەبو و مرتـەقی لـە خـۆی بـڕی بـو، خیزانـی کــاک ڕەســول خــۆی کیـشاوە و قــۆلنجی خــۆی شــەکاند و ڕوی کــردە کــاک ڕەســول و وتــی : « پیاوەکــە تــۆ کلەشـیرە مـل ڕوتەکـەت چـاوت پێنــە کــەوتووە» کــاک ڕەســول وتــی : « نــا دو ڕۆژە نــەم دیــوە» خێزانــی وتــی : « نــازانم بــۆچ وّاکــز و بــێ حــال هــەڵ ئەنیــشی وەک جــران لەگــەڵ مریــشکەکان هــاتو چــو و گاڵتــە و گەمــە ناکــات» کــاک ڕەسـول وتــی : « کلەشـــیرەکەش وەک مـــن بـــێ کەیفـــە»، زردەیـــەکی هاتـــە ســەر لیوەکــانی، بــەڵام بــەزویی لــە نــاو چــو. خێزانــی هەســتا ســەر پــێ و پیاڵەیـــەکی ماســـت و چەنـــدنانی هێنـــا و داینـــاو وتـــی : « ڕەســـو بریـــا چەنــد دانــە لــە جوجەڵــەکان مردبــاین بــەڵام مــڵ ڕوت ... ئــاوّا بــێ کــەیف نەبایــە و ... . خێزانــی کــاک ڕەســول ژنیکــی قــەڵ و خــەررە بــوو، دمــو چـــاوی لــــە پچـــوکی دا کـــە خوریکـــەی گرتبـــو ئیـــستاش لـــە زۆر جێگاکـــانی دم و چـــاوی شـــوینەکانی هـــەر دەیـــاری دەکـــرد، ژنیکـــی بــەخووّە چــالاک بــو دو کیــژی بەشــو دابــو وە ژنــی بــۆ کــوڕیکی هێنــابو ئــەوّانی لــی جیــا ببونــەوە بــەڵام کــوڕیکی مــابو ئــەویش لەعەســکەری بــو، ژنەکــە ڕوی کــردە کــاک ڕەســول وتــی : « نانەکــەت بخــۆ بــۆچ وّا دڵ بــە خــەمی » کــاک ڕەســول ســەری هــەلبریبۆ ئاســمان و تەماشــای

ئەستێرەکانی دەکرد قەڕ و قەپ دمی بەسەر یەک دادابو، کاک ڕەسول و خێزانی و پشیلەکەبێ دەنگ لە دەوری سفرەکە کۆببونەوە هەتا کزە بایەکی نە ئەهات هیوٚاش هیوٚاش مانگ شەبەقی خۆی پەخشان کرد و ئاسمان شین دیمەنێکی جوواٚنی بەخۆی گرتبو، خێزانی وتی : « شتیک بخۆ کابرا، خوواٚ گەورەیە» کاک ڕەسول وتی : « ناخۆم دڵم گێراوە هیچ برسیم نییە نازانم بۆچی دڵم دیشی هەڵسە پیالەیەکم ئاوی کۆڵاوتوم بو بەهێنە». ئەم کاک ڕەسول هەستایە سەر پێ دەستی بە دڵی گرت لە بەر هێوٚانەکە ڕاوەستا و ڕوٚانیە ناو دەشت و چیاکان بۆنی داغی و وشک بونی کەشت و کاڵی بتەواٚوی هەڵ دەمژت و دەستی شەل بۆوە. دەشت و چیاکان وٚەک گیان لە بەریکی گەوٚرە لە بەر بێ ئاوی و لە تونیان وٚەک قەڵایی ئەتوٚایەوە، لە بەر چاوی کاک ڕەسول هیوٚاش هیوٚاش ئەسوتاو وە دو کڵەکەی بەرو ئاسمان دەڕۆیشت. لە دەڵی خۆیدا وتی تەواٚوی ڕەنجی ساڵم لەبەر بێ بارانی ئەمساڵ بە فیڕو چو. لە بەر دەرد و مینەت وٚەک مار بەدەوری خویدا پێچی ئەخواٚرد و دەر و ژۆری ئەکرد. ئەم جار دانیشت و بیری لە ڕۆژەکانی ڕابردو دەکرد کە لەگەڵ کوڕەکەی و خێزانی هەموکاتی بیانیان زوگایەکانیان وەپێش خۆیان ئەدا و بۆ

کیلّان و بە سەر چۆنی بێ تاقەتیان، کاتیک حەسانەوە و ئاسایشیان نەبو، ئیوّاران ماندو و هیلاک ئەگەڕانەوە و چە نەزر و نیازیکیان دەکرد. کاک ڕەسول ئەورۆژەی کەوتەوە بیرکە گارانەکەی کویخاسمایل چوبونە ناو مەزراکەی و کاک ڕەسول وەک پیاوّان روبەرۆی کویخا ڕاوەستاو داوّای تاوّانی لە کویخا کرد . ئەمەی هاتە بەر چاو کە بیست تەغاری گەنم سەلەم کردو وە خاوەنی قەرزەکە لە شار هاتبوو داوّای قەرزەکەی دەکرد کاک رەسول بەڵینی پێدا کە ئەم ساڵ بە هیوّای خووّا تەوّاوی قەرزەکانی پێ بداتەوە، خاوەنی قەرزەکە کە ناوی کاک مەحموود بو وتی:« کاک ڕەسول ئەگەر ئەمساڵ لە کات خۆیدا تەوّاوی قەرزی سەلەمکەم پێ نەدەیوە ڕاسپێراوی حوکومەت ئەهینم و ماڵەکەت و زەوی کەت، زەوت ئەکەمە» .

کاک ڕەسول وتی:« کاک مەحموود بیری نا جۆر مەکە لە پێش تەوّاوی قەرزی خەڵکدا، بیست تەغارە گەنمەکەی تۆ جیا دەکەمەوە و پیت ئەدەم ، ئەمجار دە تەغارنۆک سەلەم کرد بو لە کاک عەلی چەرچی کاک ڕەسول عەلی چەرچی کەوتەوە بیر بە دو دەست بە سەری خۆیدا دا، لە بەر ئەمە تەوّاوی خەڵکی ئاوّایەکە لە دەست و زمانی عەلی چەرچی ورگرتبو تەوّاوی خەرج

کردبو، کەس زاتی ئەمەی نەبو بو بەربەرەکانی لەگەڵ ئەو کابرا بێ حەیا و بڕ چاوەڕو بکاتە لە بەر ئەوە عەلی چەرچی هیچی پێ عەیب نەبو، ئەوەی بە دمی داهاتبایە نەی دەگێڕاوە، مەگەر هەر عەلی چەرچی نەبو کە چەند ساڵ لەمەو بەروشکەساڵی بو لەسەر چەند پارەیەکی بێ قابیل چەکارە ساتێکی بەسەر ماڵە کاک ئەحمەدی دراوسیان هێنا، تەنیا گاجوتەکەی پێ فرۆشتن و دو بەرانبەری قەرزەکەی لی ستاندن، کاک ڕەسول بیری کەوتەوە کە هەر ئەم عەلی چەرچی بو ڕاپۆرتی لە قاسمی کوڕی دا و بەردیان بۆ عەسکەری، کاک ڕەسول وەک پەردەی سینەما ئەمانەی لە بەر چاو دادەهات و خێزی لە لاقەکانی برابو، تەنانەت کۆڵەکەی هێوانەکە بو کە کاک ڕەسولی ڕاگرتبو هەر هاواری لە خووا ئەکرد زۆری بیر کردەوە چۆن خۆی لەم چەڵەمەیە ڕزگاری بکات زۆر پاڕاوە لە درگای خووا چاوەکانی پڕ ببون لە فرمێسک، سەری هەڵپینا و ڕوی کردە ئاسمان و دەستی کرد بە پاڕانەوە لە خووای گەورە و میهربان و ... .خووای گەورە کەس نا هومیدناکات لە پڕدا هەوریکی ڕەش و توند بەری ئاسمانی گرت و هەورە تریشقە دەستی کرد بە گرماندن، تریشقەی هەورەکە بە ڕادەیەک بو تەواوی ولاتی ڕوناک کرد، بە گرمە و هاواری ئەم تریشقەیە کە

خانوکەی لەرزیۆە گایەکان لە ناو تەویلەکە دا دەستیان کرد بە هۆراندن، پەشیلەکە ڕاچڵەکی و دەستی کرد بە میاو میاو و توکەکانی قەژ بونەوە و زمانی بە دەوری لیوی دا دەهێنا. کاک ڕەسول لەبەر هیوانەکە هەر دوک دەستەکانی هەڵبری، بەرەو ئاسمان چاوەڕوانی ئەمە بو کە دلوپی باران وەدەستەکانی کەوی، لەم کاتەدا خیزانی هاواری کرد، ڕەسو ... ڕەسو پیاڵەیەکەم ئاوی کوڵاوتو بۆ هێناوی وەرە بیخووە، بەڵام کاک ڕەسول سەیری دونیایەکی کەی دەکرد گویی لە هاواری خیزانی نەبو، لەبەر ئەوە نوریکی ڕوناک کەوتبو ناو دڵی لە پڕدا هەوەڵین دڵۆپەی باران کەوتە سەر دەستەکانی پڕ بە دم هاواری کرد باران ... باران ... خووایە سەد شکور، کزە بایەکی سارد هات و باران بە گوڕم دەستی پێ کرد، وا دەباری چاوچاوی نەدەدی. کاک ڕەسول دو سی دەور بە دەوری خۆیدا سوڕا و ئەمجار بە دڵ خۆشیکی زۆر سوپاسی لە کەرەمی خووا کرد و دانیشتە سەر سفرەکە و دەستی کرد بە نان خواردن، پیاڵەیەکی پڕ کرد لە نان و ماست خستیە بەر دمی پشیلەکە و .. ئەمجار بە دڵ نیایی لە پاش نان و چایی خواردن پالێ دایەوە و لەگەڵ پشیلەکە دەستی کرد بە گاڵتە و گەپ ... .

ساڵی ١٣٧٠ هەتاوی

## نیــوّان

نیوّان

ماوەی چوّار مانگ و دە ڕوّژ بو کە بێ وچان لە قوتابخانە خریکی دەرس خویندن بوین ئەو ڕوّژەش هەر وّەک ڕوّژانی پیّشو، بەیانی لە کاتی دیاری کراو تەوّاوی قوتابیّکان لە ناو خەوّشەی قوتابخانەکە دا کوّ ببوینەوە وەیڕای هاوّالەکان دەستمان کرد بو بەیاری و گاڵتەو گەپ . لە پڕدا زەنگی لیداو هەمومان بە ریز لە بەرامبەر پوّلەکەی خوّمان ڕاوەستاین لە پاش ماوەیەک بڕیوەبەری قوتابخانەکە لەناوەڕاست هەمومان چوە سەر کورسیلەیەک ڕاوەستا ، بە تەوّاوی لە هەمومان دیاربو . لە پاش ناوی خووّا چەند وە تاریکی بە کەڵکی لە بابەت یاری و یارمەتی و پاک و خاوینی و دەرس خویندن بەشیوەیەکی زوّر باش و جوّان بوّمانی باس کرد . لەبەر ئەوە وتوویژەکەی زوّر خوّش و بەتین بو ئیمەش گەشتمان بێ دەنگ ڕاوەستابوین گویی مان بوّ وتەکانی ڕاگرتبو. قازانجیکی زوّرمان لێ وەرگرت . لە پاش تەوّاو بونی وتارەکانی بڕیوەبەری قوتابخانەکە بەم جوّرە کە ڕاوەستابوین بەئارامی یەک لە دووّایی یەک ڕوّیشتینە ناو پوّلەکانمان ئەو کاتە دەرسی وّاژین (انشاء) مان هەبو ناوی وّاژینە کە نیوّان ( فاصلە ) بو ، جا لەم دەرسەدا هیّندیک لەهاوّاڵەکان لە ئیمە باشتر وّاژینەیان ئەنوسی

هەر ڕۆژێک کە ئەم دەرسەمان بووایە ئەو چەند کەسە شانازیکی زۆریان بەخۆیان و بە نوسینەکەیان ئەکرد مامۆستای دەرسی وا ژینەکەمان پیاویکی زۆر باش بو ئیمە تەواومان بەدڵ خۆشمان ئەویست لە حەوتودا ڕۆژێک دەرسی ئەوّمان هەبو هەمومان زۆر کەیف خۆشو و سەرەحاڵ بوین ، لەبەر ئمە وتەی زۆر خۆشی بۆ دەگیڕاینەوە وە لەکەسیش توڕە نەدەبو. دایمە دەمی بە پیکەنین بو وە زۆر ڕۆژان لەکاتی خۆی لەگەڵ ئیمە خەریکی دەرس ئەبو، ئیمەش بە تەواوی گویی مان بوڕا ئەگرت، بەڵی ئەو ڕۆژە کە دەرسی وا ژین مان هەبو لە پاش هانی مامۆستا فەرزادی و چاک و چونی لەگەڵ هەمومان ئەو تاقمەی کە خۆیان ئامادەکرد بو کە وەک جاران اموستا بانگیان لی بکات و نوسینەکەیان بەخوینەوە، زۆر چاوەڕوان بون ەڵام ماموستا لەوانی بانگ نەکرد و ڕوی کردە ئەحمەد و وتی : « ئەحمەد کوڕم وەرە بەروە ئیمڕۆ تۆ وا ژینەکەت بەخوینەوە و هاوقوتابیکان هەمویان سەریان سوڕما بو تەماشای ئەحمەدیان ئەکرد. بابەزانین ئەحمەد کییَ ئەحمەد کوڕیکی فەقیر و لیقوما و هەژارە کە تەمەنی هەر دوازدە ساڵ دەبیَ لەبەر نەبونی و نە خواردن و کەساسی ڕەنگی زەرد هەڵگڕاوە و چاوەکانی بە قول دا چو وە کوڕیکی مل باریک و بیَ گۆشت بلە باریکە لە جەلوبەرگی کۆن و پینەکرا و لە بەر دا دایمە کز و مات لە حەوشەی قوتابخانەکە

لــه پەنایــەک دادەنیــشی ســەری ئەخاتــە ســەر شــانی وە لــە دورەوە تەماشــای منالّــەکان دەکــات و لەبــەر هــەژاری دایمــە ئــاهی ســارد هەڵدەکێــشی و کــەس گاڵتــە و گــەپی لەگــەڵ ناکــات زۆر لــە منالّــە هــاو کەلاســیکانی گاڵتــە و گــەپیان پــێ دەکــرت و دۆریــان ئــەدا و ناویــان نــابو ئەحمــەدە شــیت زۆر لــە منالّــەکان دەســتیان دەگــرت و بــە دەوری دا دەهــاتن بــە تێکڕایــی هاواریــان دەکــرد ئەحمــەدە شــێت تــۆ چــۆنی تــۆ لەبــەر چــی ئــەخوینی بــۆچ وا بــێ گۆشــت و خــوینی ... .ئەحمــەدی هەناســە ســارد و کەســاس لــە بــەر هــەژاری و بــێ جــەلو بــەرگی و لیقومــاوی ســەری دادەخــست و بــێ دەنــگ و ســەدا مــات دەبــو وە نــوزەی لیــوە نــە ئــەهات، لــە شــەرمان ســور هەڵــدەگرا یٚ فرمێــسکی گــەرمی بــە چاوەکــانی دا ئەهاتــە خــووار هاوڕیکــانی هــەتا ئەوکاتــەی مانــدو دەبــون گاڵتــەیان پێــدەکرد و لــە پاشــان رویــان لــی وەردەگێــرا و پەشــتیان تــی دەکــرد و لــی جیادەبونــەوە، لــە بــەر ئــەوە ئەحمــەد هــیچ دەســەلاّتی نــەبو لــە نــاو خۆیــدا خــوینی دلّــی دەخــواردەوە، بــاوکی ئەحمــەد کریکــار بــو رۆژانــە هــەتا ئیوارەیــەکی دەرنــەگ کریکــاری دەکــرد ، دایکیــشی هــەر چەنــد نەخۆشــو کەســاس بــو بــەلاّم بــۆ یارمــەتی بــە ژیــانی رۆژانــە ئیــشو کــاری دراوســیەکانی وەخۆگرتبــو . لــە مالّــەوە چــوار کــەس بــون ، بــاوکی و دایکــی و ئەحمــەد و برایــەکی پیــنج ســالاّنە تــەواویان لــە نــاو هودەیــەکی رەش و تیّــک قرماوکــە بــەکرەیان گرتــەبو

ژیانیان دەکرد. بەم حاڵەوە بەو بەدبەختی و نەداریەوە ئەحمەد شەو ڕۆژ خەریکی دەرسەکانی بو ، دەرسو مەشقەکانی زۆر باش بو وە لە بەر هەژاری و بێ بەرگ و پیڵاوی هاوڵەکانی زۆریان نیوان لیدەگرت وە ناوی ئەحمەدە شیتیان بەسەردا بڕی بو ... بەڵێ ئە ڕۆژە کە ماموستا روی تێکرد و بە گەرمی داوای لێکردو وتی ئەحمەد کورم ئیمڕو تۆ وٛاژینەکەتمان بۆ بخوینەوە ، هاوڵەکانی زۆریان پێ سەیر بو بەڵام ئەحمەد گەرمایەکی بەتینی بە دڵ دا هاتو لە جێگاکەی خۆی هەستاو هەنگاوی پتەوی هەڵ گرت و بەڕویەکی خۆشەوە ڕۆیشت بۆ لای مێزکەی مامۆستا وە لەشانی ڕاستی ئاغای فەرزادی ڕاوەستاو روی کردە هاوڵەکانی نوسراوەکەی گرت بە دەستەوە .... مناڵەکان لە ژێرەوە دەستیان کرد بە ورتە ورت ، ماموستا وتی تکایە بێ دەنگ بن با بزانین ئەحمەد چی نوسیوە. مناڵەکان بە بە تێکڕایی بێ دەنگ بون . مامۆستا ڕوی کردە ئەحمەدو وتی ئەحمەد گیان چیت نوسیوە بۆ مانی بخوینەوە. ئەحمەدی هەژار لە بەر ئەوە هەوڵ جاری بو لە شانی ڕاستی مامۆستا کەی ڕاوەستا بو وە وٛاژینەی ئەخویندەوە تەواوی هاوڵەکانی چاویان تیبەڕی بو لە شەرمان سور هەڵ گڕاو عارەقەیەکی گەرمی بە ناو چاوانی دا هاتەخووار بەڵام خۆیی شەلو نەکرد بەم جۆرە دەستی کرد بە خویندەنەوەی وٛاژینەکەی کە

نوســـیبوی. بـــه نـــاوی خـــوۆای گـــەورەو میهرەبـــان ماموســـتای خۆشەویـــستم ســـڵاو، هاوڕێـــە خۆشەویـــستەکانم ســـڵاویکی گـــەرم لـــەناخی دڵـــەوە پێـــشکەشتان ئەکـــەم . بـــەڕیزەکان هـــەرۆەک ئـــەزانن باســـی وّاژینـــەی ئـــەم کاتـــەمان ، نیۆانـــە ( فاســـلە) مـــن ئـــەوەی بـــە دڵـــم دا هـــاتووە وەزۆر دەمێکـــە لـــەناو دڵـــم دایـــە وە تـــەوّاوی نـــاو دڵمـــی پـــڕ خـــوێن کـــردووە ، وە ئیمـــڕو ماموســـتای گـــەورەم ئیزنـــی پێـــداوم مـــن بۆتـــانی بەخوینمـــەوە، ئـــەوەی لـــە نـــاو دڵـــم دابـــو ئـــەوەم نوســـییووە ئیـــستا بۆتـــانی بـــەیان دەکـــەم . ئیمـــڕو مـــن شـــانازی بـــەوە ئەکـــەم کـــەمانای نیـــۆان بـــۆ ئێـــوە بـــاس بکـــەم . تکـــام ئمەیـــە ئەگـــەر چـــەوت و نالـــە باریـــەک لـــە نوســـینوو خویندەنـــەوەدا بـــە گویتـــان گەیـــشت لـــیم ببـــورن ئیـــستا بـــەم جـــۆرە وّاژینەکـــەم بـــە گـــویی ئێـــوە ڕادەگـــەینم . هاوڕێـــە خۆشەویـــستەکانم ئێـــوە هـــەمو ڕۆژی لـــە قوتابخانـــەیان لـــە دەرەوە تـــا پێـــک دەگـــەین لـــە جیـــاتی ســـڵاو و هـــەوّاڵ پرســـین گاڵتـــە بـــە مـــن دەکـــەن و گـــەپم پـــێ دەدەن ، لـــە بـــەر ئـــەوە جـــەل و بەرگـــەکانم کـــۆن و پینـــە کـــراون ، پیڵاوەکـــانم لـــە چـــوّار لاوە دەڕاون ، لـــە بـــەر ئـــەوە کیفەکـــەم کـــە دایکـــم بـــە نەخۆشـــی و کڵـــۆڵی دانیـــشتووە لـــە کونەپـــەڕو بـــومی دەروســـت کـــردووە هـــەتا پاریزگـــاری لـــە کتیبـــەکانم بکـــات ، لـــە بـــەر ئـــەوە کـــە مـــن لـــە زســـتاندا پـــاڵتوم نیـــە وەک ئێـــوە بیکەمـــە بـــەر وە دەســـتەوّانەم نیـــە بیکەمـــە دەســـتم هـــەتا خـــۆم لـــە ســـەرمای دڵ تـــەزینی زســـتان حەشـــار بـــدەم ، تـــاکو لـــە ســـەرمان هـــەڵ

نەلەرزم وە نەخۆش نەکەوم لەبەر ئەوە لە ماوەی مانگیک ڕۆژیک نەبێ چێشتی گەرم بخۆم هەروەک ئێوە گۆشتی پێ بگرملە بەر ئەوە بەتەواوی وتێر بەزەگی خۆم نان مان نیە بیخۆم وە قووەتی پێ بگرم . باوکم کریکارە ، ڕۆژیک کاری هەبێ دو ڕۆژ بێ کارە ئەوندە دەست کەوتی نیە کەنان و خواردەمەنی تەواوی پێ بەکڕی و پارەی زۆری هەبێ بۆ مەنی بدات بە جەل و بەرگ . براو هاواڵە خۆشەویستەکانم ژیانی بنە ماڵەی ئیمە نەمردن و نە ژینە . دایکیکی فەقیرو کەساسم هەیە ئەویش لە بەر نەبونیو نەخواردن دایمە نەخۆشە . خۆشکو براکەم شم هەروا. دایکم سەرەڕایی ئەم نەخۆشیە ئەچێتە ماڵان ، ئیشێ کاریان بۆ دەکات . دەست کەوتەکەی خۆی نای خوات دەی هێنەتەوە بۆ ئیمە ، ئەگەر پارەو پولی کیان پێ دا ، کۆیی دەکاتەوە ئەیدات بەکڕی ماڵ. من خۆم زۆر جار بیر دەکەمەوە من بۆچ دیم بۆ قوتابخانەو دەرس ئەخوینم ، کاتی تێر بە زەگەم نان نەبێ بێ خۆم ، جەل و بەرگ و پیڵاوم نەبێ ، دەرسم بۆچیە . زۆر جار لەگەل دایکو باوکم باس ئەکەم ئەلێم قوتابخانە بۆ من هیهیچ قازانجی نیە ، باشتر ئمەیە لە گەڵ باوکم بەچم بۆ کریکاری بەڵام ئەوان لە وەلاٌمەم دا دەڵین کوڕم هەرجورێێت ئەبی دەرسەکانت بە خوینی . دڵم بۆ هاتەنی قوتابخانە زۆر گەرم ئەکەن . ئەڵین رۆڵە ئەحمەد تۆ ئەگەر بە خوینی ئاخری

بـه جێگایـەک ئەگـەیی ، ئەگـەر پیگەیـشتی ئـەمجار خۆتـو ئیمـەش لـە هـەزاری ڕزگـار ئەکـەیت و خۆاردەمـەنی گـەرمیش ئـەخۆینو و جـەل و بـەرگی تـازەو جـوان ئەکەینەبـەر. منـیش بـەم هیوایـە وە لـە بـەر دڵگرمـی ئەوانـە کـە هـەمو ڕۆژی بـە هومیـدو ئـارەزو دمـەوە بـۆ قوتابخانـە بـەلام دایکـو بـاوکم نـازانن کـە ئـەم هاوالانـەم کەلـە چـاوم خۆشـتەرم ئـەوین وە ڕۆژی چـوار پیـنج کـات بـە یەکـەوە بـۆ فیربـونی زانـست و زانیـاری لـە سـەر مێزیـک دادەنیـشین چـە دەردو عـەزابیک بـەمن ئـەدەن چەنـد جـوینی ناشـیرین و نالـەبار ، بـاری شـانم دەکـەن ڕۆژانـە چەنـد جـار گاڵتـەو گـەپم پـێ دەکـەن ڕۆژی چەنـد جـار دەورم ئـەدەن و پـیم دەڵـین ئەحمـەدە شـیت چـۆنی هـاتوی دەرس بـە خـوینی بـۆچ واڵـەڕو کـەم خـوینی . زۆر جـار کـە بیـر دەکەمـەوە وا ئـەزانم بەڕاسـتی مـن شـێتم ، بەکـەڵکی دەرس خوینـدن نایـەم . بـەڵی ... ئاغـای فـەرزادی نیـوانی مـن وە هاوالـە خۆشـە ویـستەکانم ئەوەیـە کـە کـاتی ڕی دە کـەوین بـەرەو قوتابخانـە زۆر لـە واڵـە قوتابیـەکانم لـە سـایەی خـوواوە باوکیـان داراو دەڵەمنـدن بـە ئوتومبیـل وە بـەرگ و جـەلی خـاوین و ڕیـک وپێـک دێنـەوە بـۆ قوتابخانـە . بـەلام مـن لـە بـەر بـێ هێزیـو وە پیلـاوە دەڕاوەکـانم هەرچەنـد لـە ماڵـەوە لـەوان زوتـر دەکەومـەڕی بـەلام دایمـە دەرەنـگ ئەگەمـە قوتابخانـە . بـەڵی مامۆسـتای خۆشەویـستم مانـای نیـوان پـیم وابێـت ئمەیـە کـاتی لـە نـاو حەوشـەکەی قوتابخانـە هاواڵـە

خۆشەویستەکانم بەیەکەوە کۆ دەبنەوە باسی تلەفزیون و بەرنامەکانی دەکەن، ئەمشەو چەیان چاوپێکەوتووە من لە قولینچکیک هەڵ دەتوشکیم و لە تاو بێحاڵی و زامی قاچەکانم دەناڵم و بیر لە ڕۆژی ڕەشی خۆم و بنەماڵەکەم دەکەمەوە، لەم بیر و باوەڕەدا تا کو لە قوتابخانە ئەگەڕیمەوە بۆ ماڵی بە هیوای ئەمە نیم جاریکی کەش چاوم بە دایکی نەخۆش و لیقوماوم بکەویت لەوە دەترسم ئەم هومید و ئاواتەی کە بە منی هەیە بیباتە ژێر گەڵ و بە ئاوات نەگات ماموستا گیان کاتی هاوڵەکانم دەورم ئەدەن و گاڵتەم پێ ئەکەن و خۆیان پڕ بە دم پێکەنن پیم ئەڵین ئەحمەدە شیت نازانن ئەم وتە پێکەنینەی ئەوان هەر وەک سیخیکس داغ و سور بۆوەیە کە دەیکیشنە بە ناو دڵی من داووە تەواوی لەشی من دەسوتین وە ئەتویومەوە، بەڵام چی بکەم خۆ من چیک لە دەست نایات تیخەمە بن گویم وە لە بیر خۆمی ئەبەمەوە، ئەمە خۆی گەورەترین نیوانە نیوانی مەن و هاوڵەکانم ... . دویی شەو کتیبەکانم لە ژێر دەست دابون خەریکی نوسین بوم باوکم پرسیاری لیکردم وتی ئەحمەد گیان کورم چی ئەنوسی وتم باوەگیان بەیانب دەرسی وازینمان هەیە، باوکم وتی بنوسە هەر چی لە ناو دڵت دایە بینوسە منیش ئەوەی بۆ ئیوەم خویندەوە نوسیم ئەمە ویست لە مەزیاتر بنوسم وە فەرقی جیاوازی نیوان زۆرتر

وجـووان تـر بیـان بکـەم بـەڵام لـە بـەر ئەمـە ماڵـەکان برقـی نییـە چـرای لەنتـەر هـەڵ دەکـەین لـە شانـسی مـن چراکـەمان نـوتی لیبـڕا و کوژایـەوە بـە تـاریکی مامـەوە ئەمـە بـو بـەخت یـاری نـەکردم، ئـەوەی لـە نـاو دڵ و میـشکم دایـە بینوسـم منـیش کوتـایی بـە نوسـینەکە هینـا، ئەحمـەد بـێ دەنـگ بـو سـەری داخـست و ڕاوەسـتا ... بتـەواو بـونی واژینەکـەی ئەحمـەد مامۆسـتا فـەرزادی و هەواڵـەکانی ئەحمـەد چاوەکانیـان پڕببـو لـە فرمیـسک و بەشـی زۆریـان بـە ئاشـکرایی و بـە دەنگـی بـەرز ئـەگریان و خامۆشـیکی قـورس لـە نـاو پۆلەکـەدا حاکـەم بـو، مامۆسـتا بـە دڵـی پـڕ لـە خەفـەت و چـاوی پـڕ فرمیـسک ئـەو بـێ دەنگیـی شـەکاند و وتـی : « ئافـەرین ... ئافـەرین بژیـت ئەحمـەدکوڕی خۆشەویـستم . بەنوسـینوو خویندنـەوی ئـەم واژینـەت مـن و زۆرلـە هاواڵـەکانت لەخـەوی گـران و مانـای نیـوان هۆشـیار کـردەوە مـن بـەپانی دونیـا لـەتو سـوپاس دەکـەم . بـەڵام ڕوڵـە گیـان ئمـەش بزانـە منـیش باوکـەم هـەروەک بـاوکی تـو کریکـار بـو منـیش هـەروەک تـو ژیـانم پـڕ لـە نـەداری و تـەنگو چەڵەمـەو نالـەبار بـو . بـەلام بـە هـەزار نـەبونیو کەساسـی مـن بەربـەرەکانیم کـردو هیـواو هۆمیـدم لـە دەسـت نـەدا بـە خوینـدن و خویندنـەوە پـەرەم پـێ داو لـە بەرامبـەر نـاکوکی و نـەبونی وەک پاڵـەوان ڕاوەسـتام هـەتا ئـاخر خـوم گەیانـدە ئـەم ڕادەیـە. بـێ شـەک تـوو تـەواوی هاواڵـەکانت بـاش ئـەزانن کـە کاروکریکـاری خـەوش

( عەیب ) نیە شەرفوو ناموسو سەر بەرزیە بۆ ئادەمیزاد . ئیمەو تەواوی ئەو کەسانەی کە لە سەر دونیا ژیان دەکەین ئەبێت بیر لەوە بکەینەوە وەتی بگەین و باش بەزانین کە لە ناو هیچ ئادەمیزادیک نیوان نیەوە ئەگەر هەش بی ئەبێت لە بەین بەچێت و نەمێنی. مامۆستا لەو بابەتەوە ماوەیەکی زۆر باسی بۆ کردین . مەبەستەکانی ئەوندە خۆش بو و ئەوندە بە کەڵک بون لە ناو دڵی هەموان دا کاریگەر بووە زۆر باش مانای نیوان حاڵی بون . لەپاش تەواو بونی وتارەکەی ماموستا ئەحمەدی گرتە ناو باوەشی و ماچی کردو دەستی بەسەردا هێنا. ئەمجار تەواوی قوتابیەکانی ناوپۆلەکە لە جێگاکەیان هەستان و هێرشیان برد بۆ ئەحمەدو گرتیانە ناو باوەشیان وە دەست وسەرو چاویان ماچ دەکردو لە کردەوەی خۆیان زۆر زۆر پەشیمان ببونەوە . گەشتیان هاواریان دەکرد ، ئەحمەد ، ئەحمەدی خۆشەویستمان لێمان ببورە لە ئەمرو بە دوواوە لە پاش مامۆستاکانمان تۆگەورەو سەروکی هەمومانی . ئیمە تەواومان بۆ فەرمانی تۆ ئامادەین . هێوامان وایە تۆ بە دڵی پاک و خاوینی خۆت لە کردەوەی ئیمە بەبوری و عەفومان بکەی . ئیمە هەمومان هۆشیار بوینەوە. وەلە ئاکارو کردارە ناشیرینەکەی خۆمان زۆر پەشیمانین تۆش ئەبێت لە مەولا گەورەیی خۆت بۆ سەر ئیمە قەبوڵ بکەیت ئیمەش تەواومان بەڵینیت پێ ئەدەین فەرمانی تۆ

هەروەک فەرمانی ماموستاکان بە ئەنجام بگەیەنین . سوارە هواری کرد بەخوا ئەحمەد نەم ئەزانی رۆحی تۆ ئەوندە بەرزەو دلی تۆ ئەوندە گەورەیە . هەریەک لە منالەکان شەتیکیان ئەوت بۆ ئەوەی ئەحمەد لەیان ببوری... بەلی خۆشەویستان بەنوسینی واژینەکەی ئەحمەد و رێنمونی ماموستای گەورەو دلسوز. ئەحمەد وەها چووە ناو دلی هاوالەکانی ئەمجار تەواوی قوتابیەکانی پۆلەکە هەرکامیان ئیشوو کارو چەلەمە یەکیان ببوایە لە گەل ئەحمەد باسیان دەکردو ئەحمەدیش بە تەوانی خۆی رینمونی دەکردن . بەلی خۆشەویستان ئەحمەد وایی لی هاتبو کەببوە نەمونەی پۆلەکەی خۆیان ...

مامۆستا فەرزادیش لە دو کانیک ئیشیکی باشی بۆ دۆزیەوە هەمو رۆژی لە پاش تەواو بونی دەرس و مەشقەکانی لە قوتابخانە دەچو بۆ ئیش کردن . لە دەست کەوتی کارەکەی جەلو بەرگی خاوین و پیلاوی باش و جووانی پیدەکڕی و یارمەتی خەرجی مالەوەشی ئەدا. دایکو باوکی زۆر شانازی بە ئەحمەد دەکەن و دەرس و مەشقەکانی ئەوندە باشن کە بۆ تە شاگرد هەوەلی قوتابخانەکە . تەواوی منالەکان و مامۆستا کانیش بە ڕادەیەکی زۆر زۆر لە کردارو رەفتاری ڕازین . ئیستا بە هیوا و دلگرمیکی تەواو خەریکی دەرس خویندەنەوە سالی ئاخری ناوەندی تەواو ئەکات ...

١٣٦٢ هەتاوی

بەشی نوهەم

تاڤان ٩

پەڵــە هــەوریکی ڕەش لــە لایەکــەوە بــەری ئاســمانی گرتیــو دەســتی کــرد بــە گرماندن بــەڵام بــاران نــەدەباری، هەورەکــە لــە بــەر ئــەوە زۆر ڕەش و تاریــک بــو نیــوەی شــارەکەی داگرتبــو، بــەڵام لایەکــەی دیکــەی ئاســمان تارمایــەکی ڕۆنــاکی لــی دیــار بــو، لــە پــڕدا لــە لای قوبلــەوە تۆزیــک هــەوری ســپی بــە قەدرایــە نیــوەی هــەورە ڕەشــەکە پەیــدا بــو، وردە وردە بــەرەو نیــوانی ئاســمانی ســەر شــارەکەمان دەهــات، خــەڵکیکی زۆر ســەریان هــەڵ بڕیبــو وە چاویــان لــە ئاســمان دەکــرد.زۆریــان پــێ ســەیر بــو لــە بــەر ئــەوە ئاســمانیان بــەم جــۆرە تاریــک و ڕون نــەدیبو . کاتیــک هــەورە ســپیەکە تیکــەڵ هــەورە ڕەشــەکە بــو لــە پــڕدا دەنگیکــی گــەورە لــە هــەورە ڕەشــەکە پێدا بــو . پــڕ بــە ئاســمان نەرانــدی ، لــەو کاتــەدا بایــەکی تونــدی دەســت پێکــردو تــەپۆ تــۆز لــە زەوی پێــدا بــو بــەلاّم زۆری نــە خایانــد بایەکــە لــە هــات و هــاوار کــەوت واّی لــیّ هــات بــەزۆری خــۆی لــەناو کۆلانــە کانــدا ڕاکێــشا ... کــاک حوســەین ســەری هــەڵبری و وتــی خــوا رەحــم بکــات کــاک ڕەحمــان کەلــە لای ڕاوەســتا بــو ڕویــی تێکــردو وتــی

چیتـه کـاک حوسـەین تـۆ مەگـەر نـازانی بـەهارە ، لـە وەرزی بـەهاردا هـەوریش ئـەگرمێنی و بـای توندیش دیتـو و بـارانیش ئـەباری و ... کـاک حوسـەین ولاٌمـی دایـەوەو وتـی ڕاسـت ئەکـەی بـرام وەرزی بـەهار هەرواّیـە بـە لاٌم پـیم واّبێـت ئیمـڕو ئاسـمان واّپیـشان ئـەدات شـەتێک بەقـەومی . کـاک ڕەحمـان وتـی بـرام خـوواّ گەورەیـە ئەینـشاالله هـیچ نـابێ مەترسـە زۆری پێنـە چـو هـەورە سـپێکە هەڕەشـەکەی لاداو ئاسـمانی ڕەشـو تاریـک سـپی هەلّگـەراو تـەواّوی واّلات ڕۆنـاک بـو . لـەو کاتـەدا خەبـەر کەوتـە نـاو شـار کابرایـەک سـە منـالّی کوّڕپـەو بـێ گوّنـاحی خـوّی خەسـتوتە نـاو چـەمی شـارەکەو بـە زۆر هەرسـەکانی خینکانـدووە. ئـەم باسـە هـەروەک بـوّم لـە نـاو شـاردا تـەقیوە و بلّـاو بـووە، زۆر لـە خـەلّکی بـە بیستەنی ئـەم کارەسـاتە سـەریان سـوڕ مـابو ، زۆریـشیان باوەڕیـان نـەدەکرد کـە پیـاویکی ئـاواّ دلّ ڕەق پێـدا بێـت و بـە دەسـتی خـوّی بـە تـواّنی جـەرگی خـوّی بـە شیـشەی سـوورەوەبو داخ بکـات . زۆر لـەو کەسـانەی کـە گـویی بیـستی ئـەم خەبـەرەبون ڕێگایـان داگـرت و بـەرو چومەکـە کەوتنـەڕی . بـای وەرزی بـەهار هەمیـسان دەسـتی کـرد بـە هـاژو هـوژو تـەپو تـوّزیکی زۆر لـە زەوی هەلّـستاو بـەرەو ئاسـمان ڕویـشت لـە هـات و هـاواّری بایەکـە تاقمێـک قەلەرەشـە کـە لەسـەر دارەکـانی قـەراخی ڕوّبارەکـە هـەلّ نیـشتبون لـە ترسـان دەسـتیان کـرد بـە قـرە قـرو لەشـەقەی بالّیـان داو هـەلّ فـرین . ئـەمجار

لە زۆر بەی هاتەنی ئەم بایە چەند پەڵە هەوریکی پچوکی ڕەش لە قەراخ ئاسمانی سەر شارەکە مابونەوە ئەوانیش بڵاو بونەوە جیگای خۆیان بە هەوری سپی گۆڕیوە. بە تەواوی ئاسمانی شارەکە ڕۆناک بو . ئەو تاقمە کەسانەی کە بەرەو چومەکە ئەرۆیشتن لە ڕیگا کۆزیلەیان ئەگرت و لە خەڵکیان دەپرسی ئەری کاکە چی قەوماوە. ئەو کەسانەی لە چۆنیەتی کارە ساتەکە بە خەبەربون وەڵامیان دەداوە بە خوا برا وەکو ئیمە بیستومانە کابرایەک بەناوی... کە زۆر هەژارو دەست کورتەوە ڕۆژانە کریکاری دەکرد وە بە هەزار کلۆلی وە داماوی نانی ڕۆژانەی بۆ خۆیو منداڵەکانی پەیدا دەکرد ، بەڵام ئیمڕۆ لە بەدبەختی وە کەساسی ئیش و کاری دەست ناکەوی و بە هەناسە ساردی ئەگەڕیتەوە بۆ ماڵی ، لە ماڵەوە لەگەڵ خیزانی دمەقەڕەیان لی پیدا دەبیٚ، هەر دوکیان بەسەر یەکتردا دەنەڕینن، و دەنگیان بەرز دە بیتەوە و شەڕەکەوای لیدی بە قەولی خۆمان بە جیگای باریک دەکیشی، پیم وابیت مەسەلەی ناموسی دیتە پیش، زۆر قەسەی سوک و سارد بە یەکتر دەڵین، کابرا دەڵی بە خووا لەبەر ئەم منداڵانە نەبووایە خۆم ئەمزانی چیم ئەکرد، خیزانی زۆر تۆرە دەبیت، چەند جنیوی سوک و نالەبار بە میردەکەی ئەدا و بە پیاوکە دەڵی نامەرد و بیٚ ... خۆ تۆ پیاو نی، ئەگەر ئەت هەوی ڕاستت پیٚ بڵیم ئەم منداڵانە هیچیان لە تۆنین، قوڕ بەسەر تۆ

منداڵەت نابی، خۆم ئەزانم چیم کردووە درگاکە بە توندی پێک دادەدا و لە ماڵەکە دەر ئەکەویت، دەتۆری و دەڕوا.

کابرا کاتی ئەم وتانە لە دەمی ژنکەی ئەبیستی لە جێگای خۆی وشک ئەبێ و چاوەکانی دەر ئەپەڕی، ڕەق ڕاوەستا و نەی ئەزانی چی بکات، لەم کاتەدا کابرا خەیاڵیکی سامناک و ترسینەر دەگریت وە چاو لە منداڵە زەرد و لاوازەکانی ئەبڕیت، کابرا سی منداڵی دەبێ دووانیان پچوک ئەبن، لەماڵەوە دەبن ئەوی کەشیان لە پلەی هەوەڵ لە قوتابخانە دەرس ئەخوینی ... .

ئەو ڕۆژەش کابرا کە بەری چاوی تاریک ببو خوینی وەکوڵ هاتبو باس باسی ناموس و شەرەف و ئابڕو بو، نەی ئەزانی چی دەکا، دو منداڵەکانی ماڵەوەی دا پێش خۆی و بەرو قوتابخانە ئەکەویتە ڕی ... کاتی ئەگەتە قوتابخانەکە لە مامۆستا کەی ئیزن بۆ کورەکەی وەردەگریت، ئەویش لەگەڵ دو منداڵەکانی کە ئەداتە پێش خۆی بەرو چۆمەکە دەکەونە ڕی، لە بەر ئەوەی وەرزی بەهارە و بەفری زستان تۆاوەتەوە و بارانیکی زۆریش لە چیا و کێوەکان باریوە ئاوی بەفر و باران تێکەڵ ببو و لافاویکی زۆر بە گوڕەم بە چومەکە دا دەهات، ئاوەکە بەڕادەیەک زۆر بو هەر شەپولی ئەدایەوە، کابرا و سی منداڵەکان گەیشتنە سەر چۆمەکە و لە جێگای زۆر بەرز ڕاوەستان کە ژێر قاچیان یەک جار زۆر قوڵ بو، کابرا شەیتان

ئەچێتە ناو کەلێشەیەوە بەری چاوەکانی تاریک دەبێ نازانی چی دەکات، هەر سی منالە بێ گوناه و لیقوماوەکانی بە پیل کیشان و بە زۆری ئەخاتە ناو چۆمەکە و ....

پەشتیان تێدەکات، منالە بەسەزمانەکان ، منالە لەڕ و لاوازەکان لە پاش یەک دو جار قوم بون و هەستانەوە ... پەشویان لیدەبڕی و ئەخنکین و ئەکەونە ژێر ئاوەکە و ... کابرا کاتی دلنیا ئەبێت کە هەر سیکیان خنکاون وە گیانی شیرینیان دەرچو وە ... ئەمجار دەکەوێتە ڕی بگەریتەوە، ماوەیەک دەڕوا وەک پەردەی سینەما وینەی منالە بێ تاوانەکانی وە کردەوەکەی خوی دێتە بەر چاو، تەزویەکی ساردی بە لەشی دادیت لە کردەوەکەی خوی زۆر زۆر پەشیمان دەبێتەوە ... ئەمجار قار و قیژی و جنیو دانی ژنەکەی و لە ژێر پێ نانی ئابرو و ناموسی ئەو ژنە بێ حەیایە و بێ ئابرویەی ئەکەویتە بیری بەم کارە ساتە زۆر پەشیو و دلگیر دەبێ و هوشی لێدەبڕی ڕێگاکەی چەپ ئەکات و ڕ ست ئەچێتە ناو پولیسخانە خوی دەناسێنی و تەواوی کارەسات و ڕوداوەکەیان بو دەگێڕیتەوە و ئەوباسە بە گویی چەند کەسیک ئەگات و لە ناو شار بلاو دەبێتەوە ئەمجار خەلکیکی زۆر لە بەر درگای پولیسخانەکە کو دەبنەوە و دەست دەکەن بە هات و هاوار لە پاش ماوەیەک چەند ڕەاسپیراوی حوکمەت لەگەل خەلکەکە بەر و چۆمەکە ئەکەونە ڕێ، لە ڕێگا هەر

کامیان لەو بابتەوە بە جۆرێک ڕاویژیان دەکرد، سەر ئەنجام دەگەنظ سطر ڕوبارەکە و چەند کەسێک کە زۆر باش ملەوانی ئەزانن خۆیان ڕوت ئەکەنەوە و خۆ ئەخەنە ناو چۆمەکە، هەتا منالە خنکاوەکان لە ژێر ئاوەکە دەربهێنن، لە پاش ماوەیەک چاوەڕوانی تەرمی منالە پچوکەکە دەخنە سەر دەست و لە ژێر ئاوەکە ئیهینە دەرەوە، هەمیسان بێن دەکێشن ئەمجار تەرمی بێ گیانب دوهەمین و سی هەمین دەر دەهێنن و هەر سی تەرمەکان لە تەنیشت یەک ڕادەکێشن، سی منالی بێ تاوان، سی منالی خۆشی لە خۆ نەدیو، سی منالی ... زۆر کەس کە چاویان بەم ڕۆداوە ئەکویت بە دەنگی بەرز دەست ئەکەن بە گریان، خەلکەکظ ئەم کابرا دلٚ ڕەقە، تفو لەعنەت دەکەن و ... .

ئەمجار خویندەوارە بەرێز و خۆشەویستەکانم زۆر جار لەم مەبەستانە بۆ ئیمە پێش دیت و یان ئەبیستین، ئەمجار ئیمەی بیر و هۆشیار ئیمەی کە چاومان کراوەتەوە و خۆمان بە کەمیک ڕوشن بیر و زانا ئەزانین باش ئەوەیە بە تەواوی بیر لەم کارەساتانە بکەینەوە و بزانین کی تاوان بارە، ئایا کابرا تاوان بارە یان سی منالەکانی تاوان بار بون یان ژنەکەی تاوان بارە کە ئەمەبەستەی هێنا پێش.؟ ئایا فەرهەنگی ئیمە تاوانی هەیە یان نەخویندەواری و بێ زانستی ژن و پیاوەکە؟ یان فەقیری و هەژاری و دەست کورتی

ئیمـه ئـەبێ لـەم بابتـەوە لـە قوڵـای دڵمانـەوە بیـر بکەینـەوە بـە بـاوەڕی مـن گـەوڕەترین خزمـەتیکی کـە ئـەتوانین بـە فەرهـەنگ و میللـەتی خۆمـان بکـەین ئەوەیـە کـە بیـر و هۆشـمان بخەینـە سـەر یـەک ڕێگـا، یـەک بـۆ ئـەم جـۆرە کارەسـاتە بدۆزینـەوە لـە بـەر ئەمـە ئـەم جـۆرە ڕۆداوانـە بـاریکی قـورس و گرانـە کـە لەسـەر شـانی تـەواوی ئیمەیـە، بەڵکـەم ئینـشاالله ئـەم جـۆرە کارەسـاتە ناحـەز و نالـەبارە لـە تـەواوی ناوچەکـەمان لـەبین بـەچیت بـەیاری خـووا، هـەرگیز ئـەم جـۆرە ڕۆداوە بە گویی مان نەگات داوا دەکەم ئینشاالله سەبەرز و سەرکەوتو بن.

ساڵی ١٣٦٥ هەتاوی

بەشی
دەهەم

مامۆستا



هـــەوەڵ مـــانگی پـــاییز بـــو هیـــوواش هیـــوواش قوتابخانـــەکان بـــۆ نـــاو نوســـین قوتابیـێکـــان ئەکرانـــەوە تـــاکو ســـاڵیکی کـــەش دەرس بـــە خـــوینین و پلـــەی زانـــست و زانیاریمـــان بـــەرزتر بیـێـــت، بـــەیانی ڕۆژی دووشـــەممە بـــو زۆر خۆشـــحال و کـــەیف خـــۆش بـــول، لـــە بـــەر ئەمـــەی کـــە دووای ســـی مانـــگ چـــاوم بـــە هاوڵـــەکانم دەکـــەوت، دەم ڕۆژە بیـــانی خـــۆم ئامـــادە کـــرد کـــە لەگـــەڵ بـــاوکم بـــۆ خۆنوســـین بچمـــە قوتابخانـــەی ئـــازادی، قوتابخانەکـــە زۆر لـــە مـــاڵی ئیمـــە دور نـــەبو مـــاوەی چەنـــد ســـاڵ بـــو هـــەر لـــەم قوتابخانـــە نـــاو نوســـیان ئـــەکردم و دەرســـم ئەخوینـــد. جـــا ئـــەو ڕۆژە کـــە بـــاوکم بـــەڵینی پیـێـدام کـــە ئـــەم بـــا بـــۆ قوتابخانـــە زۆر خۆشـــحال بـــوم، ئەونـــدەی حـــەزم بـــە دیتنـــی هاوڵـــەکانم ئـــەکرد، زۆر لـــەوە زیـــاتر حـــەزم بـــە چـــاو پیـێکـــەوتنی شـــیرین خـــانمی مامۆســـتاکەمان ئـــەکرد، شـــیرین خـــانم مامۆســـتایەکی زۆر دڵـــسوز و خـــوین گـــەرم بـــو، بـــو فیربـــونی دەرس و مەشـــقەکانمان زۆری ڕەنـــج لەگـــەڵمان دەکیـێـــشا و تـــەواوی وەختـــی خـــۆی لەگـــەڵ ئیمـــە خـــەریک ئـــە بـــو تـــەواومان بـــە ڕادەی دایکـــی خۆمـــان خۆشـــمان ئەویـــست، مـــن ئـــەو ڕۆژە لـــە خۆشـــیان نـــەم زانـــی نـــانی بـــەیانیم چـــۆن خـــوارد و لـــە نـــاو دڵـــم دا هـــەر خـــووا ... خـــوواوم بـــو کـــە بـــاوکم لـــە نـــان خـــواردن تـــەواو بیـێـــت و بـــەڕوین بـــو قوتابخانـــە و نـــاوم بنوســـن و چـــاوم بـــە

شـــیرین خـــانم و هاوڕێـــەکانم بکـــەویت، مـــن زۆر حـــەزم بەخوینـــدن دەکـــرد، زۆرم هـــەوڵ ئـــەدا کـــە ســـەرەتایی تـــەواو بکـــەم و بچـــم بـــۆ ناوەنـــدی، شـــەو و ڕۆژ خـــەریکی دەرس و مـــشقەکانم بـــوم، مـــاوەی دو ســال بــو کــە شــیرین خــانم مامۆســتای پلــەی ئیمــە بــو لــە بــەر ئەمــە زۆرم خـــۆش ئەویـــست، لـــە خوینـــدن و نوســـین دا لـــە تـــەک هاوڕێـــەکانم بەربـــەرەکانیم دەکـــرد و مـــاوەی دو ســـاڵ شـــاگرد هـــەوەڵیم وەدەســـت دەهێنـــا و نەمونـــەی پلەکـــەمان بـــوم، ئـــەو کاتـــەی مـــن بەتـــەمای بـــوم هاتـــە دی، بـــاوکم هـــاوڕی لیکـــردم و وتـــی : « پرشـــەنگ کچـــم ئەگـــەر ئامـــادەیی هەســـتە بـــڕوین بـــۆ قوتابخانـــە و نـــاوت بنوســـم». مـــن لـــە وڵـــام دا وتـــم : « بـــاوە گیـــان مـــن ئامـــادەم». هـــەر دو بەیەکـــەوە کەوتینـــە ڕی، کـــاتی ئیمـــە گەیـــشتینە قوتابخانـــە یـــەک ڕاســـت چوینـــە نـــاو هۆدەکـــەی بڕیـــوە بـــەر، لـــە پـــاش سڵاو و چـــاک و چـــۆنی بـــاوکم سوپاســـیکی زۆری لـــە هـــەمو لایـــەک کـــرد، بـــۆ ئـــەم ئەرکەگرینگـــەی کـــە لـــە ســـەر شـــانی مامۆســـتاکانە. ئـــەوانێش سوپاســـیان لـــە بـــوکم کـــرد، لـــە بـــەر ئەمـــە ســـاڵ درەنـــگ بـــو نـــاوی هـــەر کەســـیان نوســـیبایە ئـــەیان نـــاردە نـــاو پلەکـــەی بـــۆ دەرس خوینـــدن، لـــە پـــاش ناونوســـین و ڕویـــشتنی بـــاوکم منیـــشیان ڕۆانـــەی پلەکـــەمان کـــرد، لـــە درگاکـــەم دا و وەژورکـــەوتم و کـــاتی چـــاوم بـــە هاوڕێـــەکانی پـــارەم کـــەوت بـــەڕادەی دونیـــا خۆشـــحاڵ بـــوم، لـــە خۆشـــیان چاوەکـــانم پـــڕ بـــون لـــە فرمێـــسک لـــە پـــاش هـــەواڵ پرســـین و چـــاک و چـــۆنیکی زۆر و لـــە بـــاوەش

گرتنی یەکتر لە سەر کورسیلەکانمان دانیشتین و چاوەڕوانی هاتنی مامۆستاکەمان بوین، ماوەیەکی زۆری پێنەچو درگاکە کرایەوە و ژنیکی ڕێک و پێک و جووان کیلە هاتە ژرر و سڵاوی کرد و لە جێگای شیرین خانم دانیشت و خۆی ناساند، روی کردە ئیمە و وتی : « خۆشکە خۆشەویستەکانم من ناوم نەسرینە، ئەمن لە جیاتی شیرین خانم ، مامۆستای ئیوەم هیوام ئەوەیە کە کاریکی وەها بکەین لە یەک ڕازی بین، بەم جۆرە کە ئێوە لەگەڵ شیرین خانم هاودڵ و هاو گیان ڕاتان ئەبوارد لەگەڵ منیش وەها بن، منیش ئەوە لە دەستم بیت و لە تاقەتم دا بێت لە زانا و زانستی لە ئێوە دریخی ناکەم» لە پاش وتوویژیکی زۆرباش و بەکەڵک ئەم جار روی کردە من و وتی : « پڕشەنگ بەم جۆرەی بیستومە تۆ دەرسەکانت زۆر باشن و دو ساڵە شاگرد هەوەڵی، هیوام ئەمەیە ئەمساڵیش نە تەنیا تۆ، بەڵکەم تەواوتان ئەبێ زۆر باش بەخوینن روی خۆتان و منیش سور بکەنە» و نەسرین خانم بەدەم پێکەنینەوە وتوویژی دەکرد، کاتی تەواو بو من باش بیرم لە وتەکانی کردەوە و دڵم لەرزی کەوتمە بیری شیرین خانم، خەفەتیکی زۆر دایگرتم و وتە و پێکەنینەکانی نەسرین خانم نەیتوانی خەفەتی دڵم ولا دا و دڵم بکاتەوە ئیتر گویم بۆ وتەکانی و وتوویژەکانی ڕانەگرت، لە ناو دڵم دا داوام لە خووا ئەکرد بەزویی زەنگ لێدات و بەچینەوە بۆ ماڵی

خوٚمان، زوٚری پێ نەچو زەنگی لێدرا، منیش کتێبەکانم بە گوٚرجی خستە ژێر باخەڵم وەک بای شەماڵ بەر و ماڵ کەوتمە ڕێ، کاتێ گەیشتمەوە ماڵێ کتێبەکانم هەر کام بوٚ لایەم فڕێ دا، ئارەزوی گریان وەها دایگرتبوم گەروم وشک ببو، حەزم بەوە دەکرد جێگایەکی چوٚڵ بدوزمەوە و دەست بکەم بە گریان، دایکم زانی من خەفەت بارم زوٚری لێ پرسیم - پڕشەنگ چییە؟ چە قەوٚماوە؟ بوٚچ وا خەمباری؟ - دەنگم نەکرد لە قولینچکێک مات و خەمبار دانیشتم، لە قوڵای دڵەوە بیرم لە شیرین خانم دەکردەوە لە وتارە خوٚشەکانی، لە هات و چوٚ جووانکەی، لە موحبەت و خوٚشەویستیکەی، لە ئوٚگەریکی کە لەگەڵ ئێمەی هەیبو، لە وشە جووانەکانی کە بوٚ ئێمەی باس دەکرد، لە بەر خوٚمەوە وتم: « خووایە چوٚن ئەتوانم ئەمساڵ لەگەڵ نەسرین خانم کە لە هیچ بابەتێکەوە خوٚشم لێ نایە ڕابویرم، بە خووا لام وایە قەت ناتوانم هوٚگری ئەم ماموٚستایە بم و ... . پڕشەنگ بوٚ ئازار دانی نەسرین خانم زوٚری بیر کردەوە، ئەمجار لە بەر خوٚیەوە وتی: « ئەزانم چی ئەکەم، ئە بێ ئەوندەی ئازار بدەم هەتا لە قوتابخانەکە ڕابکات و ئیتر نەگەڕێتەوە، بەڵکەم بە ڕویشتنی ئەم هەمیسان شیرین خانم بگەڕێتەوە، بە بێتەوە ماموٚستای پلەکەمان ... . وردە وردە خوٚر ئاوا دەبو و دونیای ڕوناک و جووان جێگاکەی خوٚی بە شەوە زەنگی

تاریک ئالّ و گوِّڕ دەکرد. شەو بە سەر داهات و نانی شەوییان خوّارد و پڕشەنگ بە خەمناکی خەوت، بەیانی بە ئەنقەس درەنگ لە خەو هەستا دایکی هاوّاری لیکرد: « پڕشەنگ پڕشەنگ ڕوّلە زوّر درەنگە، مەگەر توّ ناچیتەوە بوّ قوتابخانە؟» ... پڕشەنگ بە بیّ تاقەتی ولّامی داوە و وتی:«دایە گیان ئەوەهاتم » کەمیّکی نان و چایی خوّارد و لە پاشان بە بوّنەی خوّ ئامادە کردن خوّی خافڵاند، ئەمجار بەرو قوتابخانەکە کەوّتە ڕێ، لە ڕیّگاش کاریکی وەهای کرد تاکو زەنگ لیدات و شاگردەکان بچنە ناو پلەکە و دەست بکەن بە دەرس خویندن، گەشت ڕوّژ ئەمە کاری بو، کاتی ئەگەیشتەوە قوتابخانەکە منالّەکان نیوەی دەرسەکانیان خویند بو پڕشەنگ بیّ ئەوەی ئیزن وەرگریت ئەچووە ژوّرەوە و لەسەر جیّگاکەی دائەنیشت، نەسرین خانم تیگەیشتبو بەلّام باسی نەدەکرد، کاتی نەسرین خانم خریکی دەرس وتنە بو، پڕشەنگ قاقەزیکی خەتی خوّڕایی ئەکیّشا.گویی بە دەرسەکە نە ئەدا، کاتی نەسرین خانم بانگی لی ئەکرد تاکو دەرسەکەی بخویّنیتەوە پڕشەنەگ بە بیّ مەیلی لە جیّگاکەی هەلدەستاو بەلّام تەوّاوی بە چەوت ئەی خویندەوە. گەشت جار نمرەی کەمی وردەگرت . نەسرین خانم لە ئاکاری پڕشەنگ سەری سوّر مابو، وە بوّ پڕشەنگ زوّر پەڕوش بو. ئەمەشی باش ئەزانی ئەم جوڕە دەرس خویندنەوەی پڕشەنگ

دەرس دەرس خوێنـــدەنی دەوٚرانـــی شـــیرین خـــانم نیـــە. هەرئـــەم پڕشـــنەگ بـــو نمونـــەی تـــەواوی پوٚلەکـــە بـــو وقوتابخانەکـــە شـــانازی پـــێ دەکـــرد. نەســـرین خـــانم زوٚر جـــار بیـــری لـــەوە دەکـــردوە هـــوٚی دەرس نەخوێنـدەنی پڕشـەنگ هاتـەنی ئـەوە بـە جێگـای شـیرین خـانم ،جاهـەر ئـەوەبو کـە لـە هـەمویان زیـاتر لەگـەڵ پڕشـەنگ خـەریک دەبـو تـاکو دڵـی وەدەسـت بێنـی . بـەڵام پڕشـەنگ لـەم هـەمو سـەرنج و لەبوردنـەی نەسـرین خـانم زوٚر گرینگـی پێنـە ئـەدا. وە لـەماڵـەوەش لـە ئاکـاموو کـرداری وٚای پێـشان ئـەدا لەگـەڵ دەرسـەکانی زوٚر خـەریک نـەدەبو لەهـەمویان زیـاتر فاتمەخانـەمی دایکـی بـو کـەبوٚی دەرکەوتـەبو پڕشـەنگ وەک پـارو پێـرار خـەریکی دەرسـو مەشـقەکانی نابێـت و زوٚر هـوٚش بـە خوێنـدن نـادات . پرسـیاری لێـدە کـرد ڕوٚڵـە کـەچم چیتـە؟ لەبـەرچی خـەریکی دەرسـەکانت نـابێ؟ پڕشـەنگ لـە وڵامـدا سـەری دا ئەخـست و مرتـەقی لـەخوٚی ئـەبڕی... هێـدی هێـدی هـاو پوٚلـەکانی لـە پەریـشانی و دووٚاکـەو تـەنی پڕشـەنگ زوٚر پـەروٚش بـون هـەمو ڕوٚژی پرسـیاریان لێـدە کـرد پڕشـەنگ چیـە چـە بـووە چیـت بەسـەر هـاتووە مەگربـە هیوٚانیـت ئەمـساڵیش شـاگرد هـەوڵی بەدەسـت بێنـی، بـوٚچ دەردەکـەت بەئیمـە ناڵیـت . پڕشـەنگ روی لـێ وەردەگیـران وە باسـی لـە گـەڵ نـەدەکردن و لـێ یـان دور ئەکەوتـەوە. هیـوٚاش هیـوٚاش تـاقی کردنـەوەی هـەوەڵ دەسـتی پـێ دەکـرد. منالـەکان شـەوو ڕوٚژ خـەریکی

دەرسو مەشقەکانیان بون تاکو نمرەی باش وەدەست بێنن بەڵام پڕشەنگ خەریک نەدەبو. ئەو پڕشەنگەی کە دایکو و باوکو هاوڕێکانی شانازیان پێ دەکرد وەها دواکەوتبو تەواوی نمرەکانی لەژێر دە بون هاوڕێکانی زۆریان دوریان لی دەکرد . تەنیا نەسرین خانم بو کەزۆر ڕۆژان ڕاویژی لەگەل دەکرد و خەمی بو ئەخوارد بەلام پڕشەنگ رۆیی خۆشی پێشان نەدەدا . ئەو رۆژە بەسەرچو بیانی نەسرین خانم چەند کتیبیکی باش و بایخ داری لەگەڵ خۆی هێنا بۆ قوتابخانە لەپاش تەواو بونی دەرسەکان کتێبەکانی دا بە پڕشەنگ و وتی پڕشەنگ ئەم کتیبانە زۆر باش و بەکەڵکن وینەو چەتی زۆر جوانیان تێدایە بیخوینەوە کەڵکی لەورگرە کاتی تەواوت کردن بۆمی بهینەوە بەلام تکایە زۆریان ئاگاداری لی بکە لەناو نەچن و شپرزەیان نەکەیت . پڕشەنگ بەنابەدڵی کتیبەکانی ورگرت بێ ئەوەی سوپاسی لی بکات خەستیە ژێر باخەڵی و ڕۆیشت کاتی گەیشتەوە ماڵی بێ ئەوە بڕوانیتە نوسراوەکان یان تەماشای وینەکانی بکات خەستیە ژێر دەستی برابچوکەکەی بۆی بەجێ هیشت براکەی لەبر ئەوە کە منالْ بو عەقلی پێ نەدەشکا دانیشتە سەرکتیبەکان زۆری شپرزە کردن و زۆر لە لاپرەکانیشی لەت و پەت کرد . بەیلنی کاتی پڕشەنگ ئەم کارەساتەی چاوپیکەوت زۆر تورە بو بەلام لەناو دڵی داوتی من بۆ دەبێ بەدڕاندنی ئەم کتیبانە

خــەفت بــەخوٚم خــوٚ هــی شــیرین خــانم نــین . خــواّی ئــەکرد تــەواّویان لــەناو ئــەچون زوٚر گرینگــی بــەم ڕوداوە نــەدا. هــەر وەهــا بــە شــەق و شــەڕی کــوٚی کــردەوە خــستیە ســەر تاقەیــەک ... . مــاوەی بیــست ڕوٚژ بەســەر چــو ڕوٚژیــک نەســرین خــانم وتــی پڕشــنگ گیــان ئــەگر کتیبــەکانت تــەواّو کــردووە بیــان هێنــەوە بــوٚمن . پڕشــنگ هــەتا ئــەو ڕوٚژە کتیبــەکانی فــەراموٚش کردبــو و لــەبیری چوبــوٚوە بــەلاّم کــاتی نەســرین خــانم کتیبــەکانی خــستەوەبیر پڕشــنگ کتیبــەدڕاوەکانی کەوتــەوە بیــر لــە شــەرمان ســورهەلّگڕا و تــەریق بــوٚوە لــە ئاســتی خــوٚی ئارەقەیــەکی ســاردی بتــەواّوی لەشــی داهاتــەخواّر . دەمێــک ڕاوەســتان وتــی باشــە خــانم بیــانی بــوٚتی ئەهێنمــەوە . لــە نەســرین خــانم دور کەوتــەوە . لــە پــاش دەرس خوینــدن وە تــەواّو بــونی قوتابخانــە منالــەکان سە،ســەو چــواّر، چــواّر لــە قوتابخانەکــە ئەهاتنــە دەرەوەو بــە گالّتــەو گــەپ بــەرەو مالّــە وە ئەکەوتنــەڕی. پڕشــەنگ بــە تــەنیا ســەری داخــستبو وە بــە دلّیکــی پــڕ لــە خــەم هێــواش هێــواش بــەرەو مالّــەوە ئەڕوٚیــشت . کــاتیٚ گەیــشتەوە مــالّی لــە بــەر بــیٚ تاقــەتی و پــەژارەیی خــوٚی ڕوٚیــشتە نــاو هوٚدەکــەی خــوٚی دەســتی کــرد بــە گریــان . هــەوەلّ لــە تــاو شــیرین خــانم ، دوهــەم بــوٚ نەخوینــدەن و وەرگرتــەنی نمــرەی کــەم ، ســیهم لــە شــەرمی ئــەوە کــە بــەیانی بەچڕوٚیەکەوەئــەم کتیبــە دڕاوّانــە بــوٚ خــانم بباتــەوە... بــیٚ تــو خــانم پڕســیاری لیبــەکات پڕشــەنگ ئــەم کتیبانــەی

بوّچ وّایان لی هاتووه. چه وّلامیک بداتەوه... زوّر دانیشت و زوّری بیرکردەوه.

کاتی ئیوّاره بو ولّات روبه تاریکی ئەروّیشت شەو بەسەرداهات. دایکی هاوّاری لیّکرد پرشەنگ وەره شیو بەخوّین. پرشەنگ چاوەکانی سورهەلْ گەرابون لە هوّدەکە هاتەدەرو دەمو چاوی شوشت و لە لای دایکو باوکی دانیشت. بەلّام دلّی گیرا بو هەر لە بیری بەیانی دابو. دایکی پرسیاری لیکرد، وتی روّلّە بوّچ وّاماتی ؟ بوّچ شیو ناخوّیت ؟ باوکی ولّامی دایەوه ووتی لام وّایە دەرسەکانی زوّرن لە بیری دەرسو مەشقەکانی دایە. پرشەنگ ولّامی دایەوه وتی بەلّی باوەگیان دەرسەکانم زوّرن منیش توّزیک دوّاکەوتوم. هەر خەریکی دەرسەکانم. بەم جوّره کوّتایی بە پرسیارەکانی دایکو باوکی هیّنا.

کاتی خەوتن هات پرشەنگ هەتا نیوه شەو خەوی لیّنەکەوت. کاتی خەوت خەوی ئالّوّز، ئالّوّزی ئەبینی وه لە پرپدا لە خەوەکە را ئەپەری. بە کورتی بەیانی کەلەخەو هەستا ، زوّر دەرەنگ بو ، نانی بەیانی نەخوّارد ، کتیبەکانی خوّیو نەسرین خانمی خستە ژیّر باخەلّی و بەرەو قوتابخانە کەوّتەری ، کاتی گەیشتە قوتابخانە کە منالّەکان زەنگی هەوەلّیان خویندەبو وه لە ناو حەوشەکەدا کایەیان دەکرد، نەسرین خانم لەناو حەوّشەکە راوەستا بو لە نەهاتنەوەی

پڕشـەنگ زۆر پـەروش بـو پڕشـنەگ کـە چـاوی بـە خـانم کـەوت ڕەنگـی بزرکـاو زۆر تێـک چـو بـەڵام وە سـەرخۆیی نـەهێنا. یـەک ڕاسـت ڕۆیـشت بـۆلای خـانم کتیبـەکانی بەشـەرمەوە بـۆ ڕاگـرت . نەسـرین خـانم بـە گـەرمی هـەواڵی پڕشـەنگی پرسـی. کـاتێ کتیبـەکانی لـێ وەرگـرت لاپـەڕە دڕاوەکـانی چـاو پێکـەوت . پڕشـەنگ سـەری داخستبو لـە شـەرمان خـوینی تـەواوی لەشـی هـاتبوە نـاو دەمـو چـاوی سـور ،سـور هەڵگـەڕابو ئارەقـەی کردبـو ، بـەڵام خـانم بەڕویـەکی خۆشـەوە وتـی پڕشـەنگ گیـان هیـوام ئەوەیـە لـەم کتێبانـە کـەڵکی باشـت لـێ وەرگرتـەبی. پڕشـەنگ چاوەکـانی پڕبـون لـە فرمیـسک و وتـی بـەڵی خـانم ، لـە مـە زیـاتر نـەیتوانی خـۆی ڕاگریـت لـە قوڵپـەی گریـانی دا. خـانم سـەری گرتـە نـاو باوەشـی ، وتـی کـەچم پڕشـەنگ گیـان چـی یـە چـی بـۆوە. پڕشـەنگ هـیچ وڵـامیکی نـەبو بیداتـەوە سـەری داخەسـتو ئـەگریا بـە دەم گریانـەوە لـە خـانم دور کەوتـەوەو ڕۆیـشت لـە پەنایەک دانیشت .

کـاتی هۆشـی هاتـەوە سـەرخۆ لـە دڵـی خۆیـدا بیـری لـە گـەرەیو و لیبـوردنی ئـەم خانمـە کـردەوە شـەرمیکی قـورس دایگـرت سـەری داخەسـت و گریـا . ئـەڕۆژەش هـەر وەک ڕۆژەکـانی کـە لـە پـاش تـەواو بـونی دەرس زەنگـی لێـداو منالـەکان لـە قوتابخانـە دەرکـەوتن و بـەرەو ماڵ کەوتنـەڕێ . لـە ماڵـەوە پڕشـەنگ لـە نـاو هۆدەکـەی خـۆی دانیـشت

و هەمیـــسان نەســـرین خـــانم و کتێبـــەکانی کەوتـــەوە بیـــر . پڕشـــەنگ لەبـــەر خۆیـــەوە وتـــی بـــە ســـە ، بـــەخوا زۆرم ئـــازاردا زۆرم بەربـــەرەکانی لەگـــەڵ کـــرد بـــەڵام هـــیچ ڕوی لـــی وەر نـــە گیـــرام ، لـــیم تـــوڕە نـــەبو بـــە خـــوا زۆر ئینـــسانیکی باشـــو زۆر ماموســـتایەکی دڵـــسوزو میهرەبانـــە مـــن لـــە خـــۆرا خـــۆم ئـــازادەدەم و دڵـــی نەســـرین خـــانم وە هاوڕێکـــانم لـــە خـــۆم بێـــزار کـــردو وە ئایـــا ئـــەم ئاکـــارەی مـــن ســـودیکی بـــە مـــن گەیانـــدو وە . لـــە زەرر زیـــاتر چـــەقازانجو ســـودیکی بـــۆ مـــن هـــەبووە. لـــە هـــەموی گرینـــگ تـــر نمـــرەی دەرســـەکانم زۆر نـــاجۆرو ژیـــر کـــەوتو وە مـــن لـــەم ماوەیـــە دا هـــەر بـــە زیـــانی خـــۆم جوڵامـــەوە . پـــاییز بـــە ســـەرچو مـــاوەی دە ڕۆژ لـــە زســـتانی ســـارد تێپـــەڕی بـــو ڕۆژیکـــی بـــەفریکی زۆر بـــاریبو. ســـەر ماکـــە وەهـــا بـــو کـــە تـــەواوی شـــەقامەکان و کۆڵانـــەکان پڕببـــون لـــە بـــەفرو ســـەهۆڵ. هـــامو شـــو کـــردن زۆر بـــە دەردەســـەری ئـــەکرا. ئـــەو ڕۆژە پڕشـــەنگ و هاوالـــەکانی خۆیـــان گەیانـــدبۆوە قوتابخانـــەو هـــەمویان دانیـــشتن لـــە نـــاو پۆلەکـــەیان و چـــاوەڕوانی هاتـــەنی نەســـرین خـــانم بـــون . مـــاوەیی کاتیـــک بەســـەر چـــو بـــەلام لـــە نەســـرین خـــانم هـــەواڵیک نـــەبو. منالـــەکان زۆر پـــەروش و مـــات بـــون جێگـــای بـــە تـــاڵی نەســـرین خـــانم لـــە نـــاو پۆلەکـــەدا بەتـــەواوی دیـــار بـــو لـــەم کاتـــەدا ســـەرۆکی قوتابخانەکـــە لـــە درگاکـــەی داو هاتـــە ژوری ،ســـڵاوی کـــردو هـــەواڵی هـــەمو منالـــەکانی پرســـی ، چـــاک وچـــۆنی لەگـــەڵ کـــردن حـــاڵی بـــو کـــە منالـــەکان لـــە نەهاتنـــەوەی نەســـرین خـــانم زۆر

پەروشـــن ، لـــە وازەیـــەک دەگـــەرا کـــە باســـی نەهاتنـــەوەی نەســـرین خانمیـــان بـــۆ بـــەکات. لـــەم کاتـــەدا یـــەکی لـــە قوتابیێکـــان بـــە نـــاوی جەمیلـــە روی کـــردە خـــانم لـــە بـــەر چـــی ئیمـــرۆ نەســـرین خـــانم بـــۆ قوتابخانـــە نـــە هـــاتۆتـــەوە؟ خـــانم وتـــی بـــە خـــوا منـــیش ئەمەویـــست لـــەم بابەتـــەوە لەگـــەڵ ئیـــوە بـــاس بکـــەم منالـــەکان بـــە تیکـــرا ســـەریان بـــەرز کـــردو گـــویی یـــان قـــوت کـــردەوە ، وتیـــان چـــی بـــووە خـــانم ؟ ئیمـــە زۆر پرۆشـــین ، خـــانم وتـــی هـــەرۆەک ئـــەزانن لـــە بـــارینی بـــەفرە زۆرەکـــە ریگـــای شـــەقامو کۆلانـــەکان پـــر لـــە بـــەفرو ســـەهۆلن . ئیمـــرو کـــاتی نەســـرین خـــانم لـــە مالـــەوە دەردەکـــەویت بیێـــت بـــۆ قوتابخانـــە لـــە ریگـــا هـــەڵ ئەخلیـــسکی و زۆر بـــە تونـــدی ئەکـــەوی وە قـــاچی ئەشـــکیت ، خـــەلکی یارمـــەتی ئـــەدەن و ئیبەنەوە بۆ مالی .

ئیـــستاش لـــە نـــاو جیگـــادا لـــە مالـــەوە کـــەوتووە. کـــاتی منالـــەکان گـــویی بیـــستی ئـــەم رووداوە ئـــەبن تیکـــرا دەســـت ئەکـــەن بـــە گریـــان . پرشـــەنگ تۆزیـــک مـــات ئـــەبێ و بیـــر ئەکاتـــەوە. بـــەلام لـــە پـــردا دەســـت ئـــەکات بـــە گریـــان و فرمیـــسکی گـــەرمی بـــە چاوەکـــان دا دیتـــە خـــواری لـــە هـــەمویان زیـــاتر پـــروش و خەفـــەت بـــار ئـــەبیت . ئـــەمجار لیبـــران دەگریـــت بـــە چیـــت بـــو لای بـــۆ هـــەواڵ پرســـین ، لـــە دەلـــی خۆیـــدا وتـــی وا باشـــترە تـــەنیا بـــەچم هـــەتا ئـــەم نـــاکۆکی و خەفـــەتی لـــە دلـــم دایـــە بـــۆی بـــاس بکـــەم ... ئـــەورۆژە خانـــەمی بریـــوە بـــەری قوتابخانـــە کـــە تـــاکو تـــەواو بـــونی کـــاتی

قوتابخانــه لــه گــه‌ڵیان خــه‌ریکی ده‌رس و مه‌شــقه‌کانیان بــو. مناڵــه‌کان بــه‌ڕو مــاڵ بکه‌ونــه ڕیــی ئــه‌وانیش بــه تیکڕایــی بــه‌ڕیار ئــه‌ده‌ن کــه له‌یــه‌ک جیــا نه‌بنــه‌وه بــۆ چاوپێکــه‌وتن و هــه‌واڵ پرســین بچــن بــۆ مــاڵی نه‌ســرین خــانم ، هــه‌مویان بــه‌ر و مــاڵی نه‌ســرین خــانم که‌وتنــه‌ڕی تــه‌نیا پرشــه‌نگ بــو لــه‌وان جیــا بــووه و بــه‌ر و مــاڵ خۆیــان که‌وتــه‌ڕی، کــاتی مناڵــه‌کان گه‌یــشتنه مــاڵی نه‌ســرین خــانم لــه درگاکــه‌یان دا و دایکــی خــانم درگاکــه‌ی کــرده‌وه و مناڵــه‌کان لــه پــاش ســڵاو، به‌گه‌شــتی خۆیــان بــه‌ژوره‌وه داکــرد و چونــه نــاو هۆده‌یــه‌ک چاویــان پێکــه‌وت نه‌ســرین خــانم لــه نــاو جێگاکــه‌ی پــاڵ کــه‌وتووه، ڕه‌نــگ و ڕوی بزرکــا بــو، کــاتی چــاوی به‌مناڵــه‌کان کــه‌وت زۆری پێخــۆش بــو، لاچــاوی هــه‌مویانی مــاچ کــرد و لــه لای خــۆی دانــان زۆری چــاو گێــڕا بــه‌ڵام چــاوی بــه پرشــه‌نگ نه‌کــه‌وت و ســه‌ر خــۆی نــه‌هێنا و هیچــی نــه‌وت دایکــی خــانم چــای و شــیرینی بــۆ هێنــان، ئــه‌مجار مناڵــه‌کان له‌گــه‌ڵ نه‌ســرین خــانم ده‌ســتیان کــرد بــه وتــووێژ، لــه پــاش ماوه‌یــه‌ک کــه بــه تــه‌واوی لــه هــه‌واڵ و چــونیتی مه‌بــه‌تــسه‌که حــاڵی بــون، ئیزڕۆیــشتنبان وه‌رگــرت، دایکــی خــانم زۆری هــه‌وڵ له‌گــه‌ڵ دان بــۆ نــان خــواردنی نیــوه‌ڕر بمینــه‌وه، بــه‌ڵام مناڵــه‌کان لــه بــه‌ر ئه‌مــه لــه ماڵــه‌وه دایــک و باوکیــان دڵ نیگــران ئــه‌بن نه‌مانــه‌وه، دوعــای لــه‌ش ســاخی و ســڵامه‌تیان بــۆ نه‌ســرین خــانم کــرد و بــه تێکرایی به‌ره‌و ماڵی خۆیان که‌وتنه ڕی ....

کاتی پڕشەنگ گەیشتەوە ماڵی هاواری لە دایکی کرد : «فاتمە خانم» زۆری پێ سەیر بو لە بەر ئەمە پڕشەنگ ماوەیەکی زۆر بو ئەوندە بێ حاڵ بو زۆری وتوویژ لەگەڵ کەس نەدەکرد، دایکی وڵامی دایەوە و وتی : « پڕشەنگ گیان ئەوە هاتم چی بووە» پڕشەنگ دانیشت بەوردی تەواوی ڕوداوەکانی بۆ دایکی گێراوە، ئەو ڕۆژە پینج شەمە بو وتی :« وا باشە پاش نیوەڕۆ چەپکەگوڵیکی جووان بەکرم و بە هومێدی خووا بەیانی کە ڕۆژی هەینی یە ئەچم بۆلای نەسرین خانم، لام وایە زۆر خۆشحاڵ ئەبێت، دایکی بە بیستنی ئەم هەواڵە لە خۆشیان چاوەکانی پڕبون لە فرمێسک، وڵامی داوە و وتی : « منیش وا ئەزانم نەسرین خانم زۆری پێ خۆش ئەبێت، ئەو ڕۆژە پڕشەنگ چەپکەگوڵیکی زۆر جووان و ڕازاوەی کڕی و ئیباتەوە بۆ ماڵی و پاریزگاریکی باشی لیدەکات، بەیانی ڕۆژی هەینی بو، پڕشەنگ زو لە خەو هەڵ دەستی و دم و چاوی ئەشوات و نان و چای ئەخوا و بەرگی خاوێن و جووان ئەکاتە بەر و خۆی باش ئامادە دەکات، لە دایکی ڕوخسەت وەردەگری و چەپکەگوڵەکەی بەدەستە دەگری و بەرە و ماڵی نەسرین خانم ئەکەویتە ڕی، هێدی هێدی بەفر ئەباری پڕشەنگ لە ترسی سەرما زۆر باش خۆی و چەپکەگولەکەی دا پێچابو ... . بەڵام سەرما تەواوی لەشی داگرتبو، دم و چاوی لە سەرمان سور هەڵگڕابو، ماوەی ماڵی

خۆیان تا کو ماڵی نەسرین خانم کەمێک دور بو لە نیوەڕێگا بڕاستی سەرما هێرشی بۆ هێنابو، بەڵام پڕشەنگ تەنیا دڵگەرمێکی کە هەبو ئەوە بو کە دەچو بۆ لای نەسرین خانم، زۆر باش و هێدی لە تەرسی کەوتن بە ڕێگاکەدا ئەڕویشت بەهەر جۆریک بو خۆی گەیاندە بەر درگای ماڵی نەسرین خانم، ئەمجار دەستی درێژ کرد و لە درگاکەی دا، زۆری نەخایاند دایکی نەسرین خانم بەڕویەکی خۆشەئە درگاکەی کردەوە و پڕشەنگ سڵاوی لیکرد و وتی : « دایە گیان هاتوم بۆ هەواڵ پرسی نەسرین خانم» دایکی زۆری بەخێرهاتن کرد و ڕێزی لیگرت، ڕینوینی کرد بۆ هۆدەکەی نەسرین خانم، کاتی چاوی پێکەوت خانم لە ناو جێگاکەی دا خەوی لیکەوتووە پڕشەنگ وتی : « دایە گیان لیوانیکم بۆ بهینە هەتا ئەم چەپکەگوڵەی بخەمە ناوی» پڕشەنگ تۆزیک حەساوە و گیانی گەرم بووە، چەپکەگوڵەکەی ڕیک و پێک کرد و خستیە ناو لێوانەکە و لە ژور سەری خانمی داینا، ژنەکەش چایەکی گەرمی لەگەڵ هیندیک شیرینی بۆ هێناو لە لای دانیشت و خەریکی گۆرەوی چنین بو، پڕشەنگ چاوی بڕی بووە مامۆستاکەی کە قاچی لە گەچ گیراوە و ڕەنگی بزڕکابو و ئارەقەیەکی ساردی لە ناو چاوانی دا ڕاوەستابو.

پڕشەنگ لە ناو دڵی خۆیدا زۆری بەزەیی بە نەسرین خانم داهات، ئەمجار دەور و بەری ڕوانی چەند شوشەیەک شەربەت و

چەند جۆرە حوبی چاو پێکەوت و چاوی بە کتێبە دەڕاوەکات کەوت کە نەسرین خانم پێدا بو بەیان خوێنیتەوە، کاتی چاوی لە دایکی خانم کرد، ژنەکە چاوەکانی زەق لە پڕشەنگ بڕیبو، پڕشەنگ کە چاوی بەم دیمەنە کەوت زۆر تەریق بۆوە وە ڕەنگی سور هەڵگڕا و ئارەقەیەکی گەرمی بە تەواوی لەشی داهاتە خوار، لە ناو دڵی خۆیدا وتی : « وا بزانم دایکی خانم لە تەواوی ئاکارەناحەزەکانی من کە لەگەڵ نەسرین خانم کردومە ئاگادارە، سەری داخست و چووە ناو دەریای بیرەوە .... .

بەڵام دایکی خانم بەڕویەکی خۆشەوە و بە ئاسپایی وتی : « کیژە جوانەکەم فەرمو چایەکەت بخووە تا کو سارد نەبۆتەوە فەرمو شیرینی بخە وا دیارە زۆر ماندو بویت، سەرماش زۆری جەزا داوی ... » لەم کاتەدا نەسرین خانم بە خەبەر بۆوە چاوەکانی کردەوە، کە چاوی بە پڕشەنگ کەوت زۆر خۆشحاڵ بو، پڕشەنگ سڵاوی لیکرد و خۆی خستە ناو باوەشی، فرمێسکەکانی بە گوڕەم بە چاوەکانیدا ئەهاتە خوار نەسرین خانم پڕشەنگی گرتە ناو باوەشی و بە خۆیەوە گوشی، لا رومەتەکانی ماچ کرد و وتی : « پڕشەنگ زۆر زۆر بە خیرهاتی بە چاوپێکەوتنی تۆ تەواوی زامی گیانم تیماربون، پڕشەنگ بە دم گریانەوە وتی : « نەسرین خانم گیان من ... من تۆم زۆر ئازار داوە، هیوام ئەوەیە بە دڵ لە تاوانەکانم ببوری، بەڵێنیت

پـی ئـەدەم کـە لەمـەو لا دەرسـەکانم زۆر بـە باشـی بـەخوینم و قوتـابێکی زەرینـگ و ڕیـک و پیـک بـم، ڕوی خـۆم لـە لای تـۆ و تـەواوی هاوڕێکـانم سـورکەمەوە ... » خـانم وتـی : « هـەوەڵ ڕۆژیـش هـەر چـاوە ڕوانـی ئـەم وتەیەی تۆ بـوم مـن زۆر هیـوام بـە تـۆ بـو لـە نـاو پۆلەکـەدا بـەڵام نـازانم لـە بـەر چـی تـۆ لـە مـن بیـزارم بـوی و لـیم دورئەکـەوتیوە، ئیـستاش درەنـگ نییـە، لـە هاتنـەت وە هێنـانی ئـەم چەپکەگوڵـە بـۆن خۆشـە سوپاسـت ئەکـەم، دویکـە تـەواوی قوتابێکـانی پۆلەکـەس خۆمـان هـاتبون بـۆ لام زۆرم چـاوگیڕا بـەڵام چـاوم بـە تـۆ نەکـەوت، زۆرت بـۆ پـەروش بـوم هەڵبـەت هـیچ کامتـان بـۆ مـن فـەرق ناکـەن، تـەواوتان ڕۆڵـەی شـیرین دڵ و گیـانی مـنن ئیمـڕوش کـە چـاوم بـە تـۆ کـەوت هێنـدەی کـە خۆشـحاڵ بـوم، نەسـرین خـانم کـاتی سـەری هـەڵبڕی وە چـاوی بـە دایکـی کـەوت ڕوانـی دایکـی ئـەگری و فرمێـسکی بـە چاوەکـانی دا دێتـە خـوار پرسـیاری لـە دایکـی کـرد و وتـی : « دایـە گیـان بـۆچی دەگـری؟» دایکـی وڵـامی دایـەوە و وتـی :« ڕۆڵـە گیـان لـە خۆشـی ئێـوە فرمێـسکی خۆشـحاڵیە ئـەیڕیژم، مـن ئـەم زانـی تـۆ دەمێـک بـو خـەمباری بـوی بـەڵام لـە لای مـن باسـەت نـەدەکرد، ئیـستا ئـەزانم خەفـەتی تـو لـە بـەرچی بـو، ئیـستا کـە تـۆ خۆشـحاڵی منـیش زۆر خۆشـحاڵم.» نەسـرین خـانم وتـی :« دایـە گیـان مـن مامۆسـتام تـەواوی قوتابێکـانم بـە ڕادەی چـاوم خـۆش دەویـن، بـەڵام پرشـەنگ ، مـن ڕۆژی

هەوەڵ هاتم بۆ ئەم قوتابخانەیە لەگەڵ سەرۆکی قوتابخانەکە باسی شارەزایی شاگردەکانم دەکرد لە پێشەوە ناو بانگی وریایی و پرهۆشی و زیرەکی تۆم بیست لە نیزکەوە کە چاوم پێت کەوت زۆرم خۆش لە ڕۆالەتت هات، بەڵام نازانم پرشەنگ تۆ بۆچی لە دیتنی من بێزار بوی، بەڵام ئیستا کە هاتوی بۆلام و بەڵینی بە منت دا کە منت خۆش ئەویت و دەرسەکانت باش ئەخوینی زۆر خۆشحاڵ بوم و لیت ڕازیم» پرشەنگ کە زانی خانم لە دڵەوە لە کردەوە ناحەزەکانی چاوپۆشی کردووە لە خۆشیان نەی ئەزانی چی بکات وچی بڵیت، دەستەکانی خستە ناو دەستی نەسرین خانم، دەستی ماچ کرد و وتی : « خانم گیان من لە گیانم زیاتر تۆم خۆشئەویت ئەمجار پرشەنگ هەستا و دەستەکانی دایکی ماموٚستاکەی ماچ کرد و هەر سیکیان دەستیان کرد بە شادی و پێکەنین چای و شیرینیان خوارد، لە پاش دانیشتن و تووێژیکی زۆر پرشەنگ هەستا و ڕوخسەتی ڕویشتنی خوازیت، دەست و چاوی ماموٚستا و دایکی ماچ کرد و خووا حافیزی لیکردن، دایکی نەسرین خانم وتی : « ڕۆلە لە ڕێگا زۆر زۆر وریای خۆت بە، خۆت باش داپێچە هەتا سەرمات نەبێ و وریا بە با هەڵنەخلیسکی و نەکویت» نەسرین خانم وتی : « زۆر لە خۆت ئاگاداری بکە ئەگەر توانیت جارجار سەرم لێبدە ئینشاالله دو سی ڕۆژیکی کە چاک

ئەبمەوە و دیمەوە بۆ قوتابخانە، سڵاوی دایک و باوکت و تەواوی هاوڵەکانی قوتابخانە بگەینە» پرشەنگ وتی:« گەشت ڕۆژ سەرت لی ئەدەم و لە خووا داوا دەکەم زۆر زو چاک بیتەوە و زوتر بێتەوە بۆ قوتابخانە ئیمەش لە ژیر سیبەری خووا و تۆ بەگینە ئەو پەری زانیاری وزانستی، ئیستاش ئەڕومەوە شەو و ڕۆژ هەوڵ ئەدەم و تیئەکۆشم تا کو خوم دەگەینمەوە، هاوڵەکانم بە هومیدی خووا ئەمسالیش شاگرد هەوەلی وەدەست دەهینم و بەلینیت پێ ئەدەم هەمیسان ببمەوە نمونەی پۆلەکە و قوتابخانەکەمان، من خانم زۆر بە هەڵە چوبوم، هەر ئاکاریکی نا حەزم کردبو تەنیا بەزەرری خوم بو، خانم گیان دەستەکانت ئخمە سەر سەرم. شوینی دۆاکەوتۆکانم پڕ ئەکەمەوە ... ، نەسرین خانم ماموٚستای پایە بەرز و خۆشەویستم تۆی چرای ڕۆناکی و ڕوشن بیری بۆ من و تەواوی هاوڵەکانم چونکە چرای زانستی و عیلم و زانایی لە دەستی تۆ دایە و وەبە دەستی تۆ و تەواوی ماموٚستا خۆشەویستەکانە» نەسرین خانم وتی :« زۆر سوپاست لێدەکەم ڕۆڵەی شیرینم هیوا دارم سەر کۆتو بێ» پرشەنگ دەستەکانی نەسرین خانم و دایکی ماچ کرد و لە سەر سەری خۆی دانا و خووا حافیزیکی گەرمی لیکردن و لی یان جیا بۆوە و بەرو ماڵی خۆیان کەوتە ڕێ ....

ساڵی ١٣٦١ هەتاوی

بەشی
یازدەهەم

**بەرەو ئاسوی رۆناکی**



لــەو کاتــەدا کــە تــەیارە بۆمهاوێژەکــانی عیراقـــی ناوچـــەیی لیقـــەوماوی کوردســـتانی عیراقیـــان بـــۆم بـــاران ئـــەکرد لـــە زۆر شـــار و گونـــدەکان خـــەڵکی دەســـتیان کـــرد بـــە ڕاکـــردن لـــە ترســـی کوشـــتن مـــاڵ و ژیانیـــان بـــەجی ئەهێـــشت و بـــەرە و ئاســـوی ڕۆنـــاکی ئەکەوتنـــە ڕی، دادە زیبـــاش یـــەکی لەوانـــە بـــو ... کـــاک ڕەئـــوفی میـــردی دو ســـاڵ لـــە مـــەو بـــەر لـــە بـــۆم بـــاران کردنـــی تـــەیارەکانی دوژمـــن لەگـــەڵ چەنـــد کەســـێکی کـــە لـــە نـــاو ئاوایەکـــەیان بـــە تەقینـــەوەی بـــۆم کـــوژرا بـــو کـــاک ڕەئـــوفی لیقـــەوماو دادەزیبـــای خێزانـــی و تـــەنیا کـــوڕیکی کۆرپـــەی ســـی ساڵانەی لـــە پـــاش بـــەجێ مـــابو ... خەڵکـــەکانی ئـــاوایی شـــلەژابون و تیکیـــان داویـــشت و ڕایـــان دەکـــرد هـــەر کەســـەی لـــە بیـــری خـــۆی دا بـــو کـــەس هۆشـــی کەســـی نـــەبو، ماوەیـــەک ڕۆیـــشتن و لـــە گوندەکـــە دور کەوتنـــەوە، لـــە بـــەر ئەمـــە مـــانگی خاکـــەلیوە بـــو لـــە پـــڕدا هـــەور گرمانـــدی و بارانـــە بـــە گـــوڕەم دەســـتی پێکـــرد بـــەبارین لـــە شـــیو و دۆڵ و چیاکـــان ئـــاوی بارانـــە کـــە وەک لافـــاو ئەهاتـــە خـــوار، دادەزیبـــای کەســـاس و لیقـــەوماو و ئـــاوارە کـــە ســـەری ڕوت و پاپـــەتی

بــو منالّــە کۆرپــە و هەناســە ساردەمە بــە تونــدی بــە خۆیــەوە ئەکوشــی و لــە بــەر ئــەوە ڕێگاکــە حەســتم و پــڕ لــە بــەرد و دەڕک و دالّ و قــوڕ بــو، ژنەکــە هێــزی لــە قــاچی دا نــەمابو، بــەڵام بــە هۆمیــدی ئاســوی ڕۆناک و جێگایەکی ئەمن و پڕئاسایش.

کـــاتی ڕانەوســـتا و ملـــی ڕێگـــای گرتبـــو وە بـــەرە و پێـــشە ئەڕۆیـــشت، لەبـــەر خۆیـــەوە دڵخوشـــی منالّەکـــەی ئـــەداوە، خـــۆی و منالّەکـــەی وەک ماســـی نـــاو ڕوبـــار تـــەڕ ببـــون، ئـــاو بـــە گـــوڕەم بـــە گیانیـــان دا ئەهاتـــە خـــووار چـــی پـــێ نـــەبو کـــە بەســـەر منالّەکـــەی دا بـــە کێـــشی کـــە بـــەتوانی لـــە تـــەڕ بـــون حەشـــاری بـــدات، لـــە ناچـــاری ئـــازادی ســـی ســـاڵانەی کـــوڕی توند بـــە ســـنگی وە ئەکۆشـــی کـــەزەی ســـاردی بایەکـــە و تـــەڕبونی لەشـــی ســـەرماکە لـــە پێـــست و گۆشـــتی تێپـــەڕی بـــو، ئێـــسقانەکانی لـــە ســـەرما وەهـــا ســـست ببـــون قـــاچی یارمـــەتی ڕێگـــا ڕۆیـــشتنی پێنەئـــەدا، لـــەم کاتـــەدا ژنـــە لیقەوماوەکـــە چاوەکـــانی گیـــڕا هـــەتا جێگایـــەک بدۆزیتـــەوە بـــۆ ماوەیـــەکی کـــەم خـــۆی و کوڕپەکـــەی لـــە چـــەنگ بـــاو و بارانەکـــە ڕزگـــار بکـــات، بـــەڵام هـــیچ جێگایـــەکی بـــەر چاو نەکـــەوت، لـــە نـــاو دڵـــی خۆیـــدا وایـــی بـــە بـــاش زانـــی کـــە ڕانەوەیـــستی و ڕۆیـــشتن و جوڵانـــەوە لـــە ڕاوەســـتان باشـــترە، کـــاتی ئـــاوڕی دایـــەوە ... ڕوانـــی پـــشت ســـەری ئەوکەســـانەی کـــە لەگـــەڵی بـــون وە لـــە دواوە

ئــەهاتن ئــەمانیش هــەر وەک ئــەو کەســاس و لیقــەوماون، هــەمویان لــەو دامــاوترن و هــەر وەک ئــەو ڕوت و قــوت و پاپــەتین، ژنــە کــە ماوەیــەکی کــەش ڕۆیــشت ئــەم برسـیایەتی هێرشــی بــۆ هێنــا بیــری کەوتــەوە لــە ترســی گیــانی خــۆی و منالەکــەی لــە بیــری چــو بــو هــیچ خۆاردەمــەنیکی لەگــەڵ خــۆی بــەهێنی، ســەری بــەرز کــردەوە و پــڕ بــە دم ئــاوی بارانەکــەی خــۆاردەوە و ماوەیــەکی کــەش ڕۆیــشت، ئــەمجار ڕاوەستا هەتا کو خەڵکەکە پی گەیشتن.

ئــەمجار ڕوی تێکــردن و هــاوّاری کــرد و وتــی :«ئــەی خۆشــک و بــرا ئــاوّارە و وەک مــن لیقــەوماوەکانم، بیکــەن بــۆ خــاتری خــووا هێــز لــە قاچــەکانم بــڕاوە ئەگــەر پێتانــە تۆزیــک نــانم پــیٚ بــەدن، مــردم لــە برســانە. منالەکەشــم لــە برســان چاوەکــانی زەرد بــووە، تــەوّاوی خەڵکەکــە لــە بــەر بارانەکــە ڕاوەســتان و بــە تێکڕایــی ســەریان داخەســتو فرمیــسکی گــەرمیان ل چاوەکــان هاتــە خــوّارو لەگــەڵ ئــاوی بارانەکــە تیکــەڵ بــو . یــەکی لــەوّان ولاّمــی داوەو وتــی بــەخوّاهیچمان هــیچ شــەک نابــەین تــۆ ســەری خــۆت داخــستووەو کەوتویتــە پێــشە وە هــەوّالّی ئیمــە نــازانی . لــەم دو ڕۆژەکــە ڕیــی کــەوتوین ســی کەســمان لــەم دیــوی ئــەم شــیوە لــە برســان مــردن و تەرمەکەیان لە سەر ڕێگا ناشت و بە جی مان هێشتن .

بەلاّم ئەگەر ئیمڕو تاقەت بە هینین تەنیا ئیمڕومان ماوە بۆ ئیوّاری خۆر ئاوّا ئەگەینە ئاسوی رۆناکی سەر سنوریکی ڕوناک ، سنوریکی پڕلەگەرما،پڕلە نان و ئاو و خوّاردەمەنی، سنوریکی پڕلەخۆشکو بڕای مویولّمان و خیرخوّاز، سنوریکی کە تەوّاوی هاو ڕەگەزو هاو ڕەسەنەکانمان باوەشی گەرمیان بۆ ئیمە کردوتەوە، تاکو بەخیر هاتنمان بکەن میوانی و میوان داریمان لی بکەن و خەم و پەژارەمان لی دور بکەنەوە وە خەفتمان لە بیر بەرنەوە، تەنگو چەلّمەی ئیمە فەقەت ئیمڕوی ماوە . دادە زیبا کاتی گویی لەو وتارە بو بە هیوّاو هومیدەوە هەمیسان پیّشکەوت و مەلی ڕیّگای گرت و بەرەو پیّشەوە کەوتە ڕی. بەم وتو ویژە ئەمجار دلّگەرمیکی سەیری کەوتە ناو لەشی هیّزو تەوّانایەکی زۆر تەوّاوی لەشی داگرت ، قاچەکانی بە هیّزتربون لە پیّشو باشتر لە ناو قوڕە کەدا یارمەتی ڕیّگا ڕۆیشتەنیان پیّ ئەدا. سەر ماو سولّۆ و باو بارانی لە بیر چۆوە. هەمیسان بە توندی کەوتە پیّش خەلّکەکە لە ناو دلّی دا وتی بەلّین بە خۆم ئەدەم کە ئیمڕوش هەروەک ڕۆژانی پیّشو تاقەت بی هینم ، ماوەیەک ڕویشت ئەمجار ڕوی وەر گیڕاوەو ڕوّانیە ناو کۆرپەکەی ناو باوەشی وتی کوڕی شیرینم ئازادگیان تەنیا هەر ئیمڕومان ماوە ئەگەر ئیمڕوش تاقەت بە

هینین لە برسیایەتی وە کەساسی وە لیقەوماوی ڕزگار ئەبین منالە داماوەکە تەنانەت چاوە کانیشی نە کردوەوە کەولامی دایکی بداتەوە ، ماوەیەکی کەش ڕۆیشت باو بارانەکەو سەرما هێزو ئاسایشی لیبرپیبو، بەلام ژنەکە هومیدەوار بو، دڵی گەرم بو بە زۆر ئاوو قورەکەی ئەبڕی وە خۆی بۆ پێشەوە ڕادەکیشا، بە هیوای پیگەیشتن بە ئاسوی ڕوناکی کاتی ڕانە ئەوەستاو... منالەکە لەژێر بارانە کەوە لە ناو باوەشی دایکی چاوەکانی کردەوە وە بە زوبانی منالیوە ، وتی دایە ، دایەگیان ... دایکی ولامی دایە وە وتی :« ڕۆلەی شیرینم هیوا و ئاواتەم، ئەزانو ئەڵی چی، بە خووا هیچ شەک نابم خوت ئەزانی ئەمە ماوەی سی ڕۆژ هیچم نەخوادووە، مەمکەکانم وشک بون لیم ببورە، هیچ نییە هەتا من بیخوم و بیکەمە شیر و شیرەکە بە تۆ بدەم ... » منالە ڕەنگ زەرد و برسی و لیقەوماوەکە لە دایکی حالی بو، زانی ئەلی چی، بۆ ماوەیەکی کەم چاوەکانی لە چاوی دایکر بڕی و تۆزیک دمی کردەوە و ئەمجار چاوەکانی خستە سەر یەک و پەشوی لیبرا و ملی بەلا دا کەوت، هەر خووا ئەیزانی چی لە ناو دم دا بو کە بە دایکی بەلیت کاتی دایکی چاوی بەم ڕۆداوە کەوت و مردنی منالەکەی لە باوەشی دا چاوپێکەوت پڕ بە دم هاواری کرد:« ئازاد

... ئـــازادی خۆشەویـــستم ڕۆڵـــەی شـــیرینم هـــەر ئیمڕۆمـــان مـــابو لەبـــەر چـــی منـــت تـــەنیا بـــەجی هێـــشت، خـــۆڵم وەســـەر، بـــۆ خـــۆت لـــە مـــن جیـــا کـــردەوە، تـــۆ خـــۆت لـــە تەنگـــەو چەڵەمـــەی ژیـــان ئـــازاد کـــرد، قـــوڕ وەســـەرم لیقـــەوماو خـــۆم دمـــی خـــستە نـــاو دمـــی بەخۆیـــەوە گوشـــی و هـــاوّاری دەکـــرد هـــەرچی کـــرد ئـــازاد نەجوڵایـــەوە کـــاتی ئەرخـــەیان بـــو کـــە کوڕەکـــەی پەشـــوی لیبـــڕاوە ڕوحـــی بـــۆ ئاســـمان ڕۆیـــشتووە، ئـــەمجار فرمێـــسکی لـــە چاوەکـــانی بـــڕا بـــو هـــەر وەک شـــیرە ژنیکـــی ئـــازار و پاڵـــەوان تەرمەکـــە لـــە ســـەر زەوی لـــە ژیـــر بارانـــە کـــە دانـــا و بـــە چـــەنگ و نینـــوخ قوڵکەیـــەکی هـــەڵ قەنـــد و بەدەســـتی خـــۆی کۆرپـــە شـــیرین و کەساســـە کـــە خـــستە نـــاو گـــۆڕی ســـاردەوە و قـــوڕی بەســـەر داکـــرد و داپۆشـــی لـــەو کاتـــەدا خەڵکەکـــە پـــێ گەیـــشتن و پرســـیاریان لیکـــرد، دادە زیبـــا چـــی بـــووە، چـــی قـــەوماوە ژنەکـــە وڵـــامی داوە و وتـــی :« ئـــازاد ... ئـــازادی کـــوڕم ... ئـــازادی شـــیرینم ڕوحـــی ئـــازاد بـــو، لـــە بەدبـــەختی و کەساســـی و برســـیایەتی ڕزگـــاری بـــو ... ئـــەمجار ســـەری هـــەڵبڕی و ڕوی کـــردە ئاســـمان، لـــەم کاتـــەدا کـــە ئـــاوی بارانەکـــە لەگـــەڵ فرمێـــسکە گکەرمـــەکانی تێکـــەڵاو ببـــو پـــڕ بـــەدم هـــاوّاری کـــرد خووّایـــە ... خـــووّای گـــەورە و میهرەبـــان تـــو تولـــەی ئیمـــە لـــە زاڵـــم بـــستینە ... ئـــەمجار لەگەڵ خەڵکەکە بەرەو ئاسوی ڕۆناکی کەوتە ڕی.

بەشی
دوازدەهم

دەردی ژین



هەر وا ئەزانم دویکە بو، ئەو کاتەی کە وا پڕ لە خۆشی و کامەڕانی بێ خەم و سەر خۆش و دور لە تەنگە و چەڵەمەی ژیان بوم، مەبەستم لە دەوڕانی منالیمە، ئیمە هەمومان باش ئەزانین کە دەوڕانی منالی ئینسان چەندە پاک و خۆش و بە دور لە گوناح و ... ئەم جۆرە بابەتانەیە - بەڵی یادی بەخیر بێت - دەوڕانی منالی، ئیستاش کە ئەم بەسەر هاتە دەنوسم سالە هاتی زۆری لەسەر تێپەڕیوە، لە دەوڕانی منالیم دا من نەخۆشیێکی زۆر بە تاو و پیسم گرت، هەزار بەریا هەر ئەو دەم بمردبایم و گیانم لە تەنگە و چەڵەمەی ڕۆژگار و ژیان ئازاد بوبایە، بەڵام چارەنوس وا بو ئەبووایە لە مردن ڕزگار بم وە توشی ئەم بەلا و نەهاتیە بم، لە بەر ئەمە کە من تەنیا منالی بنەماڵە کەمان بوم، دایک و باوکم تەنیا هەر منیان هەبو وە هیچ کوڕ و کچیکی کەیان نەبو، منیان زۆر زۆر خۆش ئەویست و هیوایەکی زۆریان بە من بو، باوکم شۆفیر ( سایق) بو، دایمەلە هات و چو دابو، دایکم

ژنێکی باش و بەڕەحم و کابان و بەهێز و توانا بو، شەو و ڕۆژ تێدەکۆشی بۆ ئاسایەشی من و باوکم. بە کورتی بڵێیم بنەماڵەیەکی زۆر سەرکەوتو وە بەختەوەر و بێ خەم بوین، دایکم زۆر زۆر ڕێزی لە باوکم دەگرت و وە لە ڕادە بەدەر منی خۆش ئەویست، ژیانیکی پڕ لە ئاسایش و زۆر خۆشمان هەبو، بەڵام دەستی ڕۆژگار ـ ڕۆژگاری چەوت و نالەبار، ڕۆژگاری حەسود و بەدکار ـ بۆ ژیانی پڕ لە خۆشی و ئاسایش ئیمە بەخیل بو، چاوی بەڕای نەدا کە ئیمە هەتا سەر ژیانمان خۆش و بێ دەردە سەر بێت و لە چەڵەمەی ژیان بە دور بین، ئەو کاتەی کە من گەورە بوم و تەمەنم لە ٢٠ ساڵ تی پەڕی بو دەست و قوڵم ئەستور بوو ئامادە بوم بۆ ئیش و کار تا بتوانم کار بکەم و دایک و باوکم بحەسینمەوە لە نەهاتی و بەدبەختی دایکم ... دایکی دڵسۆز وخەم خۆرم نەخۆش کەوت، نەخۆشیکی زۆر نالەباری پیوە نوسا، بە هیچ دوکتورو دەرمانیک چارەی نەدەکرا، دایکم ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ لاوازتر دەبو، بە قەولیک وای لیهات زەوی گیربو، ئەم نەخۆشیە ئارام و قەراری لی هەڵگیرا بو، ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ دەردەکەی گران تر ئەبو هەر وەک شەمێک ئەتوایەوە بەڵام قەت

هاوّاری ژانی لە دم دەرنە ئەهات، هەر ڕۆژێک کە بە سەر ئەچو دایکم حاڵی لە دویکە خەراب تر ئەبو، دایکم بو من و باوکم وّەک کێویکی بەرز و سەرسەوز بو، وّەک کانیکی پڕ لە ئاوی ڕون و پاک بو، وّەک چرایەکی پڕ لە شەوق بوکە تەوّاوی ناو ماڵ و کوّلانی ڕۆناک دەکرد، بەڵام داخەکەم هیچ دەرمانیک بۆ حاڵی ئەو کاریگەر نەبو، بە داخەوە زۆری نەخایاند دایکم مرد و ڕوحی پاکی ڕۆیشت بۆ ئاسمان وە گیانی پاکی لە نەخۆشی و ئەزیت و ئازار ڕزگار بو بەڕۆیشتنی دایکم ماڵەکەمان لە دار و دیوّار بونی خەم و پەژارەی لە ئەهات باوکم زۆر تیک چوبو بەڕاستی پەشتمان شەکابو . . .

ناوی باوکم ناسر بو زۆرترین کاتی لە ئیمە دور بو شەو و ڕۆژ لە سەر ئوتومبیلەکەی کە لەگەڵ کاک سابیر شەریک بو ئیشی دەکرد . ئەم شار و ئەو شار هات و چوی دەکرد، دۆستایەتی و خۆشەویستی باوکم و کاک سابیر بە ڕادەیەک بو کە سویندیان بەسەری یەک ئەخووّارد، بە ڕادەیەک ئەم دو وّانە هوّگری یەک بون کە باسی ناکری،کاک سابیر میردی پورم بو خوشکی باوکم ، پوریشیم چەمد سال لە مەوبەر نەخوشی گرتبو وە ئەویش وەک

دایکم گیانی لە عەزابی ڕۆژگار ئازاد ببو لە پاش مردنی پورم کاک سابیر ژنی کەی نەهێناوەوە تەنیا لە گەلْ کچەکەی کە ناوی نازدار بو ژیانی دەکرد . منیش لە مەکتەب هەتا پۆلی ناوندیم دەرس خویندو لە پاش ماوەیطک چوم بۆ سەربازی ( عەسکەری) دو سالْی تەواوم عەسکەری کردو لظ پاشان اجازەی ئوتومبیل لظ خورینم وەرگرت. زۆر جار لە جیاتی باوکم من بە ئوتومبیلەکە لەم شار بۆ ئەو شار بارم ئەبرد، زۆرم حەز بە کار کردەن دەکرد، زۆر تەریش لە بەر ئمەبو کە دایکم نەمابو ماڵەکەمان چولْ ببو، کاتی کە دەچومەوە بۆ ماڵی وینەی دایکە هەناسە ساردو نەخۆشەکەم ئەهاتە بظر چاو وە لە دارو دیواری ماڵەکە خەم و پژارە دەباری ، جاهەر لە بەر ئمە بو کە پیم خۆش بو لە ماڵەوە دور کەومەوە، لە جیاتی باوکم من ئیش و کار بکەم و دایمە لە هاتو چودابم . هەتا ڕۆژیک کە لە ڕۆژانی ئاخری مانگی هاوین دا بو بارم لە ئوتومبیلەکە دابوە ئەڕۆیشتم بۆ شاری ... لە شارەکەی خۆمان دەرکەوتم ، کەوتمە ڕێگاو هێدی ،هێدی ملی ڕێگام گرتبو ئەڕویشتم ، لە بەر ئمە بارەکە قورس بو نەم ئەتوانی بە پڕ تاو ئوتومبیلەکە لی خوڕم ، لە ناو ڕێگا هەر ئوتومبیلی گەورە و

پچـوک بـون کـه ئـاخرین گازیـان دابویـەو بـه لاشـانم دا ئەهاتـەنو ئەڕۆیـشتن . منـیش لـه دەسـتی خـۆم بـه تـه وّانـایی ئوتومبیلـه کـه ڕێگـا ئەڕۆیـشتم . هێـدی ،هێـدی وڵـات تاریـک دەبـو ڕۆژی ڕۆنـاک جیگاکـەی بـه شـەوه زەنـگ ئـەگۆڕیوە. لام وّایـه کاتیـک لـه شـەو تێپـەر ببـو کـه هـەوریکی ڕەش و نالـەبار لـه نـاو دڵـی ئاسـمان دا پێـدابو بـه تـەوّاوی وڵـاتی تاریـک و ڕەش کردبـو منـیش چراکـانی ئوتومبیلەکـەم داگیرسـاندبو بـه جـووّانی دەروبـەری ڕێگـام ئـەدی و بـیٚ خـەیالٚ مـەلی ڕێگـام گرتـەبو وه ئەڕۆیـشتم کـه لـه ناکـاو لـه لای شـانی ڕاسـتم چـاووم بـه ڕۆداوەیـەکی دلٚ تـەزین کـەوت تـەرمیکم دی کـه لـه قـەراخی جادەکـه زۆر بـه شـپەرزەیی کـەو تبـو، چەنـد هـەنگاو دورتـر ئوتومبیلەکـەم ڕاگـرت و بـه گـورجی هاتمـه خـوّاره وه چـرا دەسـتیەکەم تـیٚ گـرت ، ڕوّانـیم لاویکـی جووّانکەلـه کـه تەمـەنی ٢٠-٢٥ سـاڵه دەبـو کـه تـەوّاوی لەشـی غـەرقی خـوین بـو لـه قـەراخ جادەکـه فـەڕی دەڕاوه، بـه تونـدی سـۆلری ئوتومبیلەکـه بـوم بـه زویـی خـۆم گەیانـده پاسـگای پاسـەوّانی ڕێگـاو ، ڕۆداوه کـەم بۆیـان گێـراوه، ئـەوّانیش دو نەفـەریان لـه گـەلٚ خەسـتم و گەراینـەوه بـۆ سـەر تەرمەکـه لـه پـاش چـاو لیکـردن کـاتی هـەڵمان گـرت و بـەردەمان بـۆ

نەخۆشخانە کەی کە لە لای مەخفەری پولیسەکان بو ، دوکتور لە پاش چاو لیکردن و سەرنج دان لە ناو گیرفانەکانی لاوە کەدا قاقەزیکیان دۆزیوە ، نوسرا بو کەمن بە دەستی خۆم لە داخ نەبونی و نەداری و جەوری زەمانە خۆم کوشتووە، هیچ کەس خەتابارنیەو ... پولیسەکان سپاسیان لی کردەم و منیش خۆاحافیزیم لە کردنو لەنەخوشخانەکە دەرکەوتم و ۆاری ئوتومبیلەکە بوم و ملی ڕیگام گرت و ڕۆیشتم .بە ڵام وینەی ئەم لاوە هەر بەرچاو بو لە دەڵم دەرنەدەچو .لەشم سست ببو، دەستم بۆ ئیش و کار نەدەچو لە قەراخی جادەکە ئوتومبیلەکەم ڕاگرت و لە قوڵای دڵەوە وە بەراستە قینە بیرم لە تەنگو چەڵمەی ژیان و ژین و بون و نەبون وە جەوری زەمانە دەکردە وە وە زۆر دانیشتم زۆرم بیرکردەوە بۆ خۆم بە خۆم ئەوت مانای ژین چیە؟ من کیم؟ دا خوۆا بە سەر هاتی منیش ڕۆژیک بە چە ڕادەیەک ئەبیت کەوەک ئەم لاوە بە دەستی خۆم ، خۆم بە کوژم ، لە بیرم دا زۆر گەڕام ولامیکم بۆ ئەم پرسیارە نەدۆزیوە، ئاکامیکم لی وەرنەکرت . هەرچەند بیرم کردەوە بی فایدە بو ، لە پاشان دەستم کرد بە ڕۆیشتن وە ... ڕۆژانی ژیان یەک لە پاش یەک

ئـەهات و ئەڕۆیـشت .مـن تەمـەنم گەیـشتبو بـە ٢٧ سـاڵ ،ژیـانی مـن و بـاوکم ڕۆژ لەگـەڵ ڕۆژ هێـدی ، هێـدی و ئـارام بـە سـەر دەچـو . لـە ژیـان دا هیچمـان کـەم نـەبو بـەڵام داخـی گرانـی دایکـم بـە هـیچ جـۆر لـە دڵمـان دەر نـە ئـەچو ، بـەیانیان زو لـە ماڵـەوە دەر ئـەرچوم خـەریکی ئوتومبیلەکـە دەبـوم و هـەمو ڕۆژی بـارم بـۆ ئـەو شـارەو ئـەم شـار دەبـرد ، هـەرکات لـە گـاراج باریـان لـە ئوتومبیلەکـە ئـەدات خـۆم ڕادەوسـتام و چـاوە دیـریم دەکـرد ، کـاتی دڵنیـا دەبـوم ئـەمجار ڕێ دەکـەوتم و هـەمو جـاریش خەبـەرم بـە کـاک سـابیر ئـەدا کـە دڵ نیگـەران نـەبیت مـن ڕۆیـشتم ئـەویش لەگـەڵ کچەکـەی دوعـای بـەخیریان بـۆ دەکـردم، شـۆانەش لـە بـەر تـەنیای بـاوکم بـە جـۆر بایـە خـۆم ئەگەیانـدە و بـۆ مـاڵی خۆمـان هـەتا ڕۆژیـک لـە گـاراج باریـان بـۆ لـە ئوتومبیلەکـە دام و لـە بـەر ئـەوە ڕێگـای دو ڕۆژ بـۆ چونـەوە و هاتنـەوە بـو خـاوەنی بارەکـەم لەگـەڵ خـۆم سـۆار کـرد و کەوتینـە ڕێ، بـەرو مـاڵی کـاک سـابیر هـەر وەک جـاران خـەبری پـێ بـەدەم دڵ نیگـەران نـەبێت، کـاتی گەیـشتینە بـەر درگـای هاتمـە خـۆارەوە و لـە درگاکـەم دا هـیچ وڵامێـک نـەبو دو جـار سـی جـار لـە درگـام دا هـیچ خەبـەریک نـەبو، کـابرای خـاوەن بـار وتـی :« ئـەبی لـە مـاڵ نـەبن » مـن

وتم :« ئەگەر کاک سابیر لە ماڵەوە نەبێت کیژەکە بێ گۆمان ئەبۆایە لە ماڵەوە بێت نازدار قەت لە ماڵەوە دەر ناکەویت، هەتا ماڵی ئیمە کە ماڵی خاڵی بو زۆر درەنگ درەنگ ئەهات» ئەمجار بە توندی لە درگاکەم دا کەس وڵامی نەدامەوە خورپەیەک کەوتە ناو دڵم خۆم پیرانەگیرا لەسەر دەستی کابرا کەی خاوەن بارەکە خۆم هاویشتە سەر دیۆاری ماڵی کاک سابیر بازم دا بۆ ناو حەۆشەکە و درگای حەۆشەکەم کردەوە کابراش هاتە ژورەوە، کاتی گەیشتینە ناو حەۆشەکە پڕ بە دم هاۆارم لە کاک سابیر کرد، بەڵام وڵامێک نەبو، زۆرم پێ سەیر بو لە هات و هاۆاری ئیمە دو سێ کەسیش لە دارسیکانش ڕژانە ناو حەۆشەکە، یەکی لە دراوسیکان کە منی دەناسی وتی :« کاک ئازاد چییە؟ چ قەوماوە؟» وتم :« بە خوۆا نازانم هەر چەند لە درگاکەم دا کەس وڵامی ندامەوە ناچار بەسەر دیۆارەکە دا خۆم خستە ناو حەۆشەکە و چەندم هاۆار کرد وڵام نەبو، ئیستاش زۆر دڵ نیگرانم بەم ئیۆارە درەنگە چرایەک لە ناو ماڵەکە هەڵ نەگراوە ئەگەر کاک سابیر لە ماڵەوە نییە ئەی نازدار چی؟ نازدار بو وڵام ناداتەوە» کاک حوسین وتی :« دڵ نیگران مەبە داخوۆا کاک

سابیر و نازداری کچی بە میوانی بۆ کویی چون» ئەمجار خۆی گەیاندە بەر هیوانەکە و چراکەی حەوشەی داگیرساند. هۆدەکەکان گەڕاین چەمان دەست نەکەوت ئەمجار یەکی لە دراوسیکان ڕوانیە ناو باخچەکە هاواری ئەم قولکەیە چییە؟» هەمومان کاتی ڕوانیمانە ناو باخچەکە قولکەیەک وە بەر چاو ئەهات گلْ و خولیکی زۆر بەلاو بەبۆوە و ناو قولکەکە تازە پڕ کرابۆوە، زۆرم پی سەیر بو خورپەیەکی قورس کەوتە ناو دلم بە خەلکەکەم وت :« ئیوە ڕاوەستن ئەو دەگەڕیمەوە خۆم گەیاندە ماڵەوە و ڕوداوەکەم بۆ باوکم گیڕاوە باوکم بە پەلە درگاکەی داخست و کەوتینە ڕی، خۆمان گەیاندە ماڵی کاک سابیر ئەمجار گەشتمان بە دەست خۆلْ و گلی ناو چالەکەمان لادا زۆری نەخەیاند تەرمی کاک سابیری هەناسە ساردی لیقەوماو کە تەواوی لەشی شین و ڕەش هەلگەڕابو دەر کەوت باوکم خۆی پیرانەگیرا بە هەر دو دەست بەسەری خۆی دا دا و هاواری لی پیدا بو وەک جۆگە ئاوی بە چاوەکانی دا ئەهاتە خوار، من کە چاوم بەم ڕوداوە کەوت هیز لە ئەژنوکانم بڕا، بەلام خۆم لە سەر پی ڕاگرت وەک بای شەمالْ دەرکەوتم و خۆم گەیاندە دائیرەی

پـــۆلیس و ڕۆداوەکـــەم بـــۆ گێڕانـــەوە و بـــە بـــێ ماتـــەڵی دو پـــۆلیس لەگـــەڵم ڕی کـــەوتن خۆمـــان گەیانـــدە مـــاڵی کـــاک ســـابیر ئـــەوانیش چاویـــان بـــە ڕۆداوەکـــە کـــەوت، بـــاوکم هـــاواری کـــرد نـــازدار، نـــازداری کچـــی بـــۆ دیـــار نییـــە؟ هەمیـــسان لەگـــەڵ پۆلیـــسەکان خۆمـــان بـــە هۆدەکان دا کرد و هەرچی گەڕاین لە نازدار خەبر نەبو ... .

بـــاوکم و پۆلیـــسەکان ڕخـــستیان بـــە مـــن دا بـــاری کـــابرا بەگـــەینم وە، بـــاوکم و دراوســـێکانیش تـــەرمی کـــاک ســـابیر بـــەرن بـــۆ قەبرســـتان، پۆلیـــسەکان بـــەڵێنیان دا کـــە پیـــاوکوژ و نـــازدار بدۆزنـــە وە ... مـــاوەی چەنـــد ڕۆژێـــک بەســـەر چـــو لـــە پـــاش لیکوڵینـــەوە یـــەکی زۆر و بـــێ وچـــان دائیـــرەی پـــۆلیس چەنـــد کەســـیکی گـــرت و یـــەکی لەمانـــە بەرازاکـــەی کـــاک ســـابیر بونـــە نـــاوی مەنـــسور کـــە لاویکـــی بەدفـــەڕ و چـــەقوکیش و عەمـــەلی و ڕاهـــاتو و معتـــاد بـــو زۆر بـــێ شـــەرم بـــێ حـــەیا بـــە شـــاهیدی دراوســـێکانی مـــاڵی کـــاک ســـابیر چەنـــد جـــار مەنـــسور بـــەر درگـــای مـــاڵی بـــە کـــاک ســـابیر گرتبـــووە داوای پارەیـــەکی زۆری لیکـــرد بـــو و زۆری هەڕەشـــە دەکـــرد و چەنـــد جـــاریش هیرشـــی بـــۆ کـــاک ســـابیر و کچەکـــەی دەبـــا و دەڵـــی ئەگـــەر ئـــەم پارەیـــەم پـــێ نـــەدەی بـــە خـــوا خـــۆت و نـــازدار کچـــت ئـــەکوژم کـــاک ســـابیری بەســـتزمان هـــەمو

جاریــک ئەونــدە پــارە لــە گیرفــانی دا دەبیــت پێــی ئــەدات و لــە بــەر ئەوە ڕازی ئەبێت شەکایەتی لە ناکات.

کــاتی دراوســێکان ئەمانــەیان بــۆ پۆلیــسخانە گیــڕاوە دائیــرەی پــۆلیس دڵنیــا بــو کــە کارکــاری مەنــسورە ئــەو چەنــد کەســەی گرتبویــان هــەمویان بــەڕڵا کــرد و مەنــسوریان خــستە ژێــڕ وتــوویژ لــە پــاش دمەقاڵەیــەکی زۆر مەنــسور زانــی کــە هــیچ ڕێگــای هــەڵاتی نییــە چەنــد جــاریش کــەوتبو نــاو گرتوخانــە، چــارەی نــەما بــە وردی تــەواوی ڕۆداوەکــەی گیــڕاوە و وتــی :« ئیمــە دوکــەس بــوین، مــن و حامیــد ئیــوە و هــەمو کــەس حامیــد دەناســی کــە تــاکو ئیــستا لەســەر چەقوکیــشان و نامــەردی و ناپێــاوی و ئیــشی چــەوت و نالــەبار چەنــد جــار حــەبس کــراوە، لــە نــاو بەندیخانــەش دا ئیــشی نــاڕەوا و ناپیاوانــەی دەکــرد، هــەمو ڕۆژی لــە بەندیخانــە لەگــەڵ پۆلیــسەکان شــەڕ و کێــشەی ســاز دەکــرد و لــە پــاش چەنــد ســاڵ لــە حــەبس هاتــە دەرەوە، هەمیــسان دەســتی کــردەوە بــە ئاکــاری پیــشوی بــە زۆر و بــە تەشــقەڵە پارەیــەکی زۆری لــە کــاک ســابیر هەتانــد و هــەمو جــاری هەڕەشــەی لــە مــن دەکــرد ئەگــەر لەگــەڵی نــەچم بۆمــاڵی مــامم ـ ئــەکوت بــەخوۆا خۆمــارت ئەکــەمو ( هــەڕۆینت ) پــێ نــادم وە شــەویک ئــەت کــوژم ـ

منیش لە ترسی خوماری و کوشتن لەگەڵی ئەچوم، مامەم لە ترسی گیانی خۆی و کچەکەی پارەی بە حامید دەدا و حامید بۆ دڵنیایی مامە سابیرم کوتەقاقەزیکی بە ناوی (چەک) پیێ ئەدا و وەئە وت:« ئەم ڕۆژانە تەواوی قەرزەکانت پیێ ئەدەمەوە و چەکەکانم وەردەگەرموە»، حامید هەمو جاریش ئەگەر ئەچوین بۆ پارە هەڕەشەی دەکرد و ئەکوت :« ئەگەر پارەم پیێ نەدەیت بە خوواڵ شەویک خۆت و کچەکە ئەکوژم»، کاک سابیر لە ترسان هەرچی دەست کەوتی بوبایە پیێ ئەدا، بە کورتی چەکەکان زۆر بون و حامید هیچ پار و پولێکی نەبو بیدات بە کاک سابیر و لەمە ئەترسا ڕۆژیک کاک سابیر تەواوی چەکەکان بەریت بو حەکومەت و شەکایەتی لی بکات، ئەمجار حامید بکەویتە ناو گرتوخانە و ئیتر کاری تەواو بو، بەبی ماتەڵی ملی بە دارەوە دەکرا جا هەر لە بەر ئەمە بو ئەو ڕۆژە منی گرت و وتی :« وەرە بەڕۆین بۆ ماڵی مامەت هەتا بەزۆریش بێت من تەواوی چەکەکانمی لی بستینمەوە» من دەرمانەکەم (هیروئین) لیبڕا بو هۆشم نەمابو وتم :« بە خوواڵ حامید من سازنیم زۆر خومارم ناتوانم لەگەڵت بیم، ئەو نامەردە تیێری تی هەڵدام و تۆزیکی ( هیروئین ) پی دام

و کاتی کەوتمە سەر حاڵ هەتا بەر درگاکەی ماڵی کاک سابیر لەگەڵی چوم بە منی وت تۆ لە بەر درگاکە ڕاوەستە خۆشی بەسەز دیوارە کە دا خۆی هاویشتە ژورە وە من تۆزیک ڕاوەستام ئیتر ڕۆیشتم بە خووا ئیتر نەم زانی چی بووە چی قووماوە مەنسوریان گرت و چەپسیان کرد، چەند کەس لە پۆلیسەکان بۆ دۆزینەوە و گرتنی حامید خۆیان ئامادە کرد، باوکەم لە تاو کاک سابیر هۆشی لیبڕابو شەو و ڕۆژ خوواردن و خەوی نەبو لە ماڵەوە خۆی حەبس کردبو وە دەستەوئەژنو دانیشت بو منیش ئیش و کارم ویل کرد و شەو و ڕۆژ بە شوین حامید دا دەگەڕام، دو سی ڕۆژی خایاند هەتا دەمی ئیوارە بو کە حامید لە مالیک دا کە خەریکی تەریاک کیشان بو پۆلیسەکان دەوری ماڵەکەگەمارو ئەدەن و حامید دەگرین و ئەبەنە پۆلیسخانە من کە ئەم موژدەیەم بە گویی گەیشت خۆم گەیاندە ئەویی و ڕۆ بەڕوی حامید دانیشتم، کاتی بەوردی تیم ڕوانی وە بیرم کەوتەوە کە پارەکە ئەم حامیدە بو کە ئەو شەوە لە کۆڵانی ئیمە چەند چەقوی لە شان و پیلی دڕاوسیکەمان داوە وە هەڵات و ڕای کرد، ئیستاش کەس نەیدۆزیەوە. ڕاسپیراوی حوکومەت زۆری وتوویژ لەگەڵ کرد،

حامید زانی هیچ چارەی نەماوە بەم جۆرە درکاندی کە کاک سابیر و کچەکەی چۆن کوشتووە و وتی :« ئەو شەوە چەند جارم بە سابیر وت چەکەکانم بداتەوە هیچ پارەیەکەم نییە پی بەدم، ئەگینا خۆت و کچەکەت ئەکوژم، بەڵام سابیر ئەهمیەتی پیێ نەدام و وتی هەر کات پارەکانمت هێناوە ئەمەی پیو داوی ئەمجار چەکەکانت پیێ ئەدەمەوە ... ۆا باشە ئەمەش بەڵیم تاکو ئیستا کەس نیتۆانیوە ۆا لە بەرانبەری من ڕاوەستییێ من زۆر کەسم دزیوە لە پاش وەرگرتنی پارەیەکی زۆر بەرەڵام کردون، زۆر پیێ سەیر پیاویکی ۆەک سابیر بەتۆانی لە بەرانبەری من دا ڕاوەستی تاکو ئیستا چەن پیاو و ژنم کوشتووە وە زۆر جار لە بەندیخانەی شارەکان هەڵاتومو وە خۆم ڕزگار کردووە پیاویکی ۆەک سابیر چۆن ئەتۆانی بەم جۆرە وڵامی من بداتەوە و بەربەرەکانی لەگەڵ من بکات، زۆرم هەڕەشە لی کرد ئەهمیەتی پیێ نەدام، منیش لە بەر ئەمە وڵات ڕۆناک بو وتم هاۆار پیدابیت دراوسیکان ئەڕژینە حەۆشە لەماڵەکەی دەرکەوتم و گەڵاڵەم کیشا بۆ شەویکی تر، نیوەشەو بو ئوتومبیلی کەم دەزی و بە هیۆاشی خۆم گەیاندە بەر درگاکەیان بە ئاسپایی لە دیۆارەکە سەر کەوتم خۆم گەیاندە بەر

هیۆانەکە لە ئیقبالّی من سوچێکی درگاکە کرابۆوە هیۆاش هیۆاش خۆم گەیاندە ناو هۆدەیەک بختەوەڕانە شوقی مانگە شەو لە شوشەی پەنجەرەکە هاتبو بو ناو هۆدەکە کاتی ورد ڕۆانیم سابیر بە تەنیا لە هەموجێگایەک بێ خەبەر و خاتر جەم لە خەوی شیرین دا بو منیش وەک هەلّو پەتیکم کە لە پێشەوە ئامادە کردبو لە ناو با خەلّم دەرهێنا و پێچامە دەوری ملّی بە تەواوی هێز و توۆانایی خۆم بام دا هەتا بە تەواوی هەناسەم لیبڕی و خەنکاندم، ئەمجار ڕام کێشا بۆ ناو حەۆشەکە و قولّکەیەکم هەلّ قەند، خستمە ناو قولّکەکە لە داپۆشینی دا بوم کچەکەی لە خەو هەستا بو کاتی چاوی بە من کەوت و تەرمی باوکی چاو پێکەوت هات هاوار بکات من خۆم گەیاندیی بەم بیلّەی کە بە دەستمەوە بۆ دو سی جار لە توقی سەریم دا و بێ هۆشم کرد و مرتەقی لیبڕا، ئەمجار تەرمی سابیرم دا پۆشی و کاتی تەواو بوم لەشی نیوەگیانی کیژەکەم دا بە کۆلّم دا و بە ئاسپایی لە مالّەکە دەر کەوتم، بە ئاسپایی درگای حەۆشەکەم داخست و کەس دیار نەبو ،کیژەکە خستە ناو سەندوقی ئوتومبیلەکە و هیۆاش هیۆاش لە ناو شار دەرکەوتم، هەتا گەیشتمە ناو دارستانیک ئوتومبیلەکەم

ڕاگـرت و سـەندوقەکەم کـردەوە کیژکـە هـەر بـێ هـۆش بـو هێنامـە دەرەوە و ڕام کێشا و بـەنزینم بـە تـەواوی لەشـی دا کـرد و ئـاگرم تێبـەردا و سـوتاندم و ... . مـن کـاتی ئـەم بـاس و ڕوداوەم لـەم پیـاوە نامـەرد و دڵ ڕەقـە بـە گـویی گەیـشت چاوەکـانم پڕبـون لـە فرمێـسک و ئاگـەریکی گـەرم کەوتـە نـاو لەشـم لـە پاشـان تەزویـەکی سـارد لـە نـوقی سـەرم بریـسکەی دا و لـە ژیـر پـیم هاتـە دەر، دمـم وشـک بـو خـوین بـەری چاوەکـانمی گـرت بـەڕادەی چـاو وێکنانێـک لـە پیـستی ئـادمیزاد دەرچـوم و بـوم بـە حێـوانیکی خـوین خـۆر هیـواش هیـواش خـۆم گەیانـدە حامیـد لـە پیـشەوە چەقۆکـەم لـە نـاو گیرفانـدا ئامـادە کردبـو، هێرشـم بـۆ و سـەر دەڵـیم نیـشانە گرتـو پـەیتا پـەیتا سـی جـار چـوار جـار چەقۆکـەم لـە سـەر دڵـی دا و خـوینی ناپـاکی وەک کـانی لـە سـەر دڵـی هـەڵقوڵی و تەرمەکـەی کەوتـە زەوی لـە دەسـت و بـەردی مـن پۆلیـسەکان واق مـابون ئـەمجار سـی پـۆلیس دەوریـان دام منیـان لـە سـەر تـەرمی ناپـاکی حامیـد بـەرز کـردەوە و هۆشـم لیبـڕا بـو کـاتی کـە لەپچـەیان لـە دەسـتەکانم دا ڕوانـیم حامیـد چاوەکـانی دەرپـەڕیبو و هەناسـەی لیبـڕا بـو پۆلیـسەکان منیـان لـە هۆدەکـە دەر خـست و بـەیان بـەردم بـۆ گرتوخانـە لـە بـەر درگـا کـە لـە پـڕدا یـەکی بـە تونـدی

باوەشـــی پێـــدا کـــردم دەســـتی گـــەرم و ڕۆخۆشـــی بەســـەرم داهێنـــا و ئـــاوڕم داوە ڕوانـــیم باوکمـــە چەنـــد دڵۆپـــە فرمێـــسکی گـــەرم بـــە دم و چـــاوی دا ئەهاتـــە خـــوار وتـــم:«باوکـــە هەناســـە ســـارد و لیقەوماوەکـــە، باوکـــە بێکـــەس و کارەکـــەم، باوکـــە ڕیـــش ســـپی و تـــەنیا کـــەم خـــوا حـــافیز» چـــاوم بـــەری نـــاو چاوەکـــانی و لـــە پاشـــان ســـەرم داخـــست، باوکـــەم هـــەر ئەونـــدەی وت ڕۆڵـــە شـــیرین و بـــێ دایکەکـــەم خـــوات لەگـــەڵ منیـــان خـــستە نـــاو حەوشـــەی گرتوخانـــە کـــە و باوکیـــشم لـــە پاش درگاکە بەجێ ما ....